# ڕەفیق چالاك

## پەلكەزێڕینەی هونەر و داهێنان

نیگاری: ئارام عەلی


ڕۆڤار

30



بلاوكراوەیەكی ڕۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێك دەریدەكات



## ڕەفیق چالاک.. پەلکەزێڕینەی هونەر و داهێنان!

دوور لە دنیای بە ژەنگ و ژاری سیاسەت و هەندێ جومگەی ژیانی حزبایەتی و داچوونی ئەم پیاوە تیایدا! بەڵام نزیک و زۆرنزیک لە جیهانە گەورە و ڕەنگاڵەکەی هونەر و پرشنگەکانی بەهرە و ئەفراندن و سەردەق شکێنی لە چەندین بواری داهێنانی جۆراوجۆردا، بێ سێودووکردن، ئەتوانین بڵێین:

ڕەفیق چالاک، یەکێکە لەو چل چرا بێ هاوتاو دەگمەنانەی کە بەبنمیچی ماڵە سپی و جوانەکەی کولتووری ئێمەوە هەمیشە ورشەو پرتەیەتی و، بتەوێ و نەتەوێ، سەرنجت بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ. ئەم پیاوە بەهرەدار و دەست ڕەنگینە لە ناوەڕاستی چلەکانەوە بۆ شەستەکانی سەدەی ڕابوردوو جێپەنجەی لێزانی و هونەرکاری وزرنگی بەگەڵ لایەنی تازەکردنەوەو نوێکارییەوە دیارە و، بەردەوامیش کلپەیەک بووە لە جووڵەو زیرەکی و بەخششی بەبرشتی هونەرمەندانە. ڕەفیق چالاک، لە درەختێکی بەرداری چروپڕی هەڵچەی گوێ ڕووبارێ چووە، تۆ بڕوانە ئەو هەموو پژوپۆ ڕەنگین و جوانانەی کە لەم پیاوە بوونەتەو:

نووسەرێکی پێشەنگی پەخشانی کوردی

ئەکتەرو دەرهێنەرو وەرگێڕ لە شانۆی کوردیدا

یەکەمین قەڵەمێ کە چیرۆکی تەمسیلی هێنایە ناو ڕادیۆی کوردییەوە

یەکێک لە بێژەرە دەم و پل پاراوو بە تواناکانی ڕادیۆو کۆڕ و کۆبوونەوە گشتیەکان

ڕۆژنامەوانێکی بە سەلیقەولێهاتوو

دەنگ خۆش و ئاواز دانەر بۆ چەندین سروودی میللی و گۆرانیی کوردی

سەر دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵی هونەرە جوانەکان لە شاری سلێمانی.

خاوەن"زاکیرە"یەکی ئیجگار تیژ و سینەیەکی فراوان بۆ لە بەرکردنی سەدان شیعر و چیرۆک و بەیت و بالوورە و پەند بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی.

هونەرمەندێکی گەورەی ئاواو، کەچی تا ئەمڕۆیش بەوجۆرە بەسەرنەکراوەتەوە کە پێویست بوو بکرێت. لەم ڕووەوە ڕەفیق چالاکی نووسەرو هونەرمەند غەدری لێکراوەو هەقی خۆی نەدراوەتێ و لە جێی خۆیدایەتی هەرلێرەدا ددان بەوەدا بنێین کە ئێمە قەرزاربارێ ئەم بەهرە گەورەیەی کوردین. بۆیە وەک وەفایەکی بچووک"ڕۆڤار" ئەم ژمارەیەی خۆی بۆ تەرخانکردووە و هەوڵمان داوە زۆرترین زانیاری لە بارەی ژیانی ئەم هونەرمەندە و بەرهەمە جۆربەجۆرەکانیەوە بخەینە بەر دەستی خوێنەرانی گۆڤارەکەمان هەروەکوو لە سەرەتاشدا ئاماژەمان بۆ کردووە. ئێمە"ڕەفیق چالاک"ی پەلکەزێڕینەی ئەدەبی و هونەریمان مەقسەدبووە. ئەو پەلکە زێڕینەیەی کە هیچ خاوەن و یزدانێ نکووڵی لێناکات و با ئەوەی تازەیشمان ئەم ڕابوردووە پرشنگدارەی خۆیان لە یاد نەکەن و ئەگەر بۆ ساتەوەختێکیش بووە گیانی ئەم هونەرمەندە مەزنە شادبکەین!

ڕۆڤار

## شێوەکار ئارام عەلی



لە سلێمانی لە دایکبووە ساڵی 1967، بەشداری کۆمەڵێک چالاکی هونەری کردووە، چەندین کاری هونەری هەیە لە دەرەوەی وڵات، چەند خەڵاتێکی وەرگرتووە لە بواری شێوەکاریدا، ساڵی 2002 یەکەم پێشەنگای تایبەتی خۆی کردۆتەوە. ئێستا خاوەنی (گەلەری ئارام عەلی)یە لە سلێمانی.

## ژمارەکانی ڕابردوو

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، موحەڕەم محەمەد ئەمین، دڵدار، مەستوورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، حسێن عارف، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ..


سەرپەرشتیاری گشتی
شێرکۆ بێکەس

ڕاوێژکار
ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار
یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری
قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر
یادگار ئەوڕەحمان

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێک دەریدەکات



ناونیشان
سلێمانی فولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ت: 3129609

لە دەرەوەی وڵات
Tel: 00441628477660
Fax: 00441628486008

Web Site
www.sardam.info

Email
Sardam@sardam.info



چاپخانەی (شڤان)

# ژین نامەی باوك ومامۆستاو هاوڕێم ڕەفیق چالاك

چالاك ڕەفیق چالاك



## بنەماڵە:

ناوی تەواوی رفیق توفیق محمود ڕەسووڵە و لە بەر زیرەکی و بلیمەتی ناز ناوی چالاکی لێ نراوە.

باوکی بە توفیقە سوور مەشهوور بوە و لە سەردەم و تافی لاویدا هاوڕێی ئەحەی ناسرو ڕەفیقی گلەبوە و لە خۆشەویستی هاوڕێکەی کوڕەکەی ناوناوە ڕەفیق.

تەوفیقە سووری باوکی لە دایك بووی ساڵی1897بوە و بەپێی ئەمری ئیداری ژمارە9587/230 لە 23ی تەمموزی 1927دا کە لە بەغداوە دەرچوە بە قۆڵچی خەیالدا دەمەزرێ ومانگانەکەی(60) ڕوپیە بووە، بۆ ماوەیەکیش لەمەکینەی کارەبای سلێمانی کاردەکات کەلەگەڕەکی گاوران بوە و لە ساڵی1943دا کۆچی دوایی کردوە.

باوکی تەوفیقە سوور بەمحمود ئاغای ڕەسول ئاغای پشدەر ناسراوە، دایکی تەوفیقەسوور ناوی فاتمەیەو کچی فتح للە ئاغای سنەیی بوە.

دایکی رەفیق چالاك ناوی ڕەعنایەو باوکی ڕەعنابانەیی یەو ناوی ئەحەرەشی بەقاڵ بووە و دایکی ڕەعنا سنەیی بوە و بە خاتونە فتح الله اغای سنەیی ناسراوە و بە خزمایەتیش دایك و باوکی رەفیق چالاك پورزای یەك بوون لە دایکەوە.

رەفیق چالاك لە ساڵی 1923دا لە گەڕەکی پیرمەسووری سلێمانی لە دایك دەبێ و نۆبەرەی سێ برای ترە، فایق، نامیق، هەر لە منالیەوە چۆتە حوجرەکەی شیخ حسین کە بەرامبەر ماڵی خلیل چاوەش بوە لە پیرمەسوور، بۆ یەکەم جار کە بیستووە زۆر منالبوە کە کاتێك تیپێکی کەشافە بەباندی موسیقاوە بەسەر شەقامەکانی سلێمانیدا گەڕاون.

بەهۆی گواستنەوەی باوکیەوە لە ساڵی1932دا چوونەتە کۆیەو پۆلی یەکەم و دووەمی سەرەتایی لەوێ تەواو کردوە و لە ساڵی 1934دا چوونەتە سەنگە سەرو دوای ئەویش گەڕاونەتەوە سلێمانی و خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی فەیصەلیە تەواو دەکات.

بۆ یەکەم جار لە ساڵی1935دا چۆتەسەر شانۆو دەوری خزمەتکارێکی پێ سپێردراوە.

دوای تەواو کردنی خوێندنی سەرەتایی لە سلێمانی، دەچێتە دار المعلمینی ریفی لە ڕۆستەمیەی نزیك بەغداو ساڵی1941دەبێت بە مامۆستا لە قوتابخانەکانی سلێمانیدا.

لە ساڵی 1942دا لەگەڵ ماموستا گۆران و ڕەمزی قزازدا بە فەرمانی کۆمەڵی هیوا دەچن بۆ فەلەستین و لەوێ لە ئیزگەی کوردی یافا بۆ ماوەی(3)سێ ساڵ خزمەتی نەتەوەکەیان دەکەن.

لە مانگی ئابی1944دا گەڕایەوە بەغداو لە ئێستگەی کوردی بۆ جاری یەکەم دامەزرا و بەدەنگە زوڵاڵەکەی دەڵێ(ئێرە ئێزگەی کوردستانی عێراقە)، دوای سێ ڕۆژ لێی قەدەغە دەکەن، پاش یەك مانگ لەسەر نووسینێکی شۆڕشگێڕی بە ناوی (گۆرانی ئازادی چین) لە ئیزگە دەردەکرێ و ئایەڵن نووسینەکەشی لە گەلاوێژدا بلاوبکرێتەوە و ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و بۆتەوە بە مامۆستا لە سورداش و دوایی لە قەمچوغە و جافەران.

لە ساڵی1946دا ڕۆڵێکی سەرەکی دیوە لەو هەوڵەی کە درا بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی بۆڵ قەوماوانی بوومەلەرزەکەی یەکەمی پێنجوین لەڕێی تەمسیلکردن و ئاهەنگی گۆرانی لە سلێمانی و هەولێر، لە نەورۆزی ساڵی 1947دا بۆ یەکەم جار ئاهەنگی نەورۆز بە ئاشکرا لە هۆڵی(شعب)ی بەغدا کراو ووتارێ بە کوردی دەخوێنێتەوە کە زۆر توندوتیژ دەبێ وابزانم وایە کاك همزەعبداللە ووتارەکەی نووسیبوو، هەر لەو ئاهەنگەدا گوڵی خوێناوی پێشکەش کردوە.

لە هاوینی ساڵی1947دا و دوای تێکچوونی کۆماری مەهاباد و خنکاندنی چوار ئەفسەرەکە، بەهۆی ئەو ووتارەی لەسەرقەبران بۆ خەڵکەکەی خوێندۆتەوە لە مامۆستایەتی دەردەکرێ.

ئیتر دوای ئەوە تا ساڵی 1950 بە سیاسەت و مەینەتی و کوێرەوەری وسجن و ئازار وئەشکەنجە دەگوزەرێنێ.

لە دوای ئازادکردنی لە زیندان و لەڕێی چەند دۆست و برادەرێکی خۆشەویستیەوە لە ئێستگەی کوردی ئیشی بۆ ئەدۆزنەوە و هەموو هەفتەیەك چیرۆکێکی تەمسیلی ئیو سەعاتی(نووسراو یان وەرگێڕدراو)ی ئامادە ئەکرد و سەرلەنوێ نەخشەی نوێی ژیانی دەکێشێتەوە.

لە پاش ماوەیەك دەبێ بە بێژەر و دەست دەکات بەڕاست کردنەوەی باری ئیزگەی کوردی لە هەموو ڕوویەکەوە و تیپێکی




تەمسیلی دادەمەزرێنێ، لە ئابی 1956دا دەگوێزرێتەوە بۆ کێڵگەی بەکرەجۆ لە سلیمانی و دەکرێ بە مأمور مخزن، لەگەڵ هاتنەوەیدا لەلایەن هاوڕێکانیەوە داوای لێ دەکرێ کە بەشداری چالاکیە هونەریەکان بکات.

لە1957/7/5دا و دوای ڕەزامەندی ڕەسمی دامەزراندنی کۆمەڵی هونەرەجوانەکان دەستەی بەڕێوەبەر بە ئامادەبوونی زۆربەی ئەندامان هەڵدەبژێرن و ڕەفیق چالاك بە سەرۆکی کۆمەڵ دەردەچێ.

لە ساڵی 1959دا دیسان لە کار دەردەکرێ و لە ساڵی1961 لە ئیدارە محلی بە مستخدم دا دەمەزرێ و ڕۆژانەکەی 750فلس دەبێت و پاش ماوەیەك بۆی دەکرێ بەدینارێك.

لە 9ی حوزەیرانی ساڵی1963دا لەگەڵ جەماوەری شارەکەیدا دەگیرێ و لە حامیەی سلێمانی دەمێنێتەوە تا 1963/7/25 ئینجاڕەوانەی سجنی سلێمانی دەکرێت تا لە1963/10/14دا بە کەفالەتی 500دینار ئازاد دەکرێ، لە 1964/6/22 دا بەفەرمانبەر لە بیطری سلێمانی دادەمەزرێتەوە.

لە ساڵی1965دا دیسان دەگیرێتەوە و لە ساڵی1966دا ئازاد دەکرێ ودوور دەخرێتەوە لە سلێمانی و بڕیاری گواستنەوەی دەردەچێ بۆ بەڕێوەبەرێتی بیطری بەغدا.

لە کۆتایی ساڵی1968دا بەبڕیاری مجلس قیادەی ثورە لەوە زیفە دەردەکرێ و فەرمانی گرتنی دەردەچێ، ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوەی بەرەو کوردستان بگەڕێتەوە و پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەو شۆڕشی گەلی کوردەوە بکات.

تاوەکو ساڵی1970لێ پرسراوی ئیزگەی کوردستانی عیراق دەبێت.

لەدوای ڕێکەوتننامەی ئازاری1970دەگەڕێتەوە سەرکارەکەی خۆی ولە وەزارەتی شوئونی شیمال دەبێ بەبەڕێوەبەری اعلامی مەرکەزی ئەو وەزارەتە.

هەر لەو ساڵانەی حەفتادا لە پاشکۆی ڕۆژنامەی التاخی دا نووسەردەبێت بۆ ماوەیەکیش دەبێت بە لێپرسراوی بەشەکوردیەکەی کە(برایەتی) بوو.

لە ساڵی 1972دا بەشێك لە بیرەوەریە هونەرییەکانی لە برایەتیدا بڵاودەکاتەوە.

هەر لەوساڵەدا بەسەرۆکی کۆمەڵی هونەر و وێژەی کوردی لقی بەغدا هەڵدەبژێردرێ و دوا شانۆگەری خۆی لە هۆڵی زانکۆی مستنصریە بە ناوی(دکتۆری دێم) پێشکەش دەکا و لە حوزەیرانی1973دا دوا گۆرانی بەدەنگی خۆی لە ناو نوێنی نەخۆشی دڵا تۆماردەکا کە هۆنراوەی مصطفی بەگی کوردیە بە ناوی(شوێن کەوتن).

ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی1973/11/30 لە شاری بەغدا کۆچی دوای دەکات و تەرمەکەی لە سەروەسیەتی خۆی لە گردی سەیوان بەخاك دەسپێردرێ.

# ئەوەی ئەیزانم لەبارەی هونەرەوە



شانۆگەری لەڕێی نیشتماندا 1. ڕەفیق چالاك، 2. نوری وەشتی

تەمەن لە رادەیەكدا ئەوەستێ و ژیانی هەمو كەسێك دوایی دێ، كەس خۆی بۆ سبەینێ هەڵنەگرێ! ئەوەی ئەم سەعاتە پێمان ئەكرێ با نەیخەینە سەعاتێكی تر، چونكە دور نیە ئەو سەعاتەی تر لە دارە مەیتا بین! من وا بیر ئەكەمەوەو لەبەر یەك شتیش لە مردن ئەترسم، ئەویش ئەوەیە كە نەیەڵێت پوختەی ئەوەی فێربوم بیگەیێنم بەنەتەوەكەمو ئەگینا حەسرەت بۆ هیچی تری ناو ئەم ژیانە هەڵناكێشمو تكا لە هەمو یەكێكیش ئەكەم، چی لە تواناداهەیە لە كرداری باش و لە نوسین درێغی نەكات هەتا نەمردوە.

ئەم چەند دێرەم بۆیە نوسی بەڵكو هەندێ كەس بجوڵێنم بەبێ تورەكردن! ئەگینا ئەوەش ئەزانم كەبە (تورە) بون هەمو كەسێك ئەجوڵێ! ئێستاش با دەست پێ بكەین:

بۆ جاری یەكەم كە ناوی تەمسیلم بیست زۆر منداڵ بوم، لە ساڵێكدا بو كە مامۆستای خۆشەویستم، كاك فۆاد رشیدی محمد بكر ئەزانێت ساڵی چەندەو بێ گومان لە بەینی 1925وە تا 1928دایەو چیرۆكەكە لەم شوێن خانوەی ئێستاكەی ماڵی خوا لێ خۆشبو تۆفیق قزازدا كرا لە سلێمانی، كاك خسرەوی حاجی ئاغاو خوا لێ خۆشبو فۆادی صالح قەفتانی تیابو، گۆرانی ناو چیرۆكەكە بەم جۆرە دەستی پێ ئەكرد: ئافەرین خەسرەو! شێری شیرین سوار ئەوەی ئەوشیروان شیرینی نازدار.

ئنجا چیرۆكەكە، نوسەرەكەی، بەشدارانی، ومێژوی پێش ئەم چیرۆكەو دوای ئەمەش بەرەو ڕوی مامۆستام فۆاد رشید ئەكەمەوە چونكە لەبارەی مێژوی هونەرەوە ئەو بەشارەزا ئەزانمو ئەویش منی خستە سەر ڕێی هونەر، هەر بۆ جاری یەكەم كە مۆسیقام بیست لەسەر شەقامی سولەیمانی بو، منداڵ بوین گوێمان لە مۆسیقا بو رامان كردو تەماشا ئەكەین قوتابین و یەك جۆرە جل و بەرگیان لەبەردایە كە ناوی جلی كەشافەیەو بەتیپەكەشیان ئەوت (باندی مۆسیقا) وەك بەبیرما بێت هەمو ئالەتێكی هەوایی تیابو، لەگەڵ دەهۆڵ و ترامپێت و تاس مەعروفا، بۆ ئەم لایەنە هەر تەنیا خوا لێ خۆشبو فۆاد قەفتانم لەبیر ماوە كە فیفرە یان كلارنێتی لێ ئەدا، نازانم بڵێم لەم بارەیەوە لەكێ بپرسین، بەڵام تكام وایە یەكێك لەو برایانە مەردانە بجوڵێ و دەربارەی ئەو یەكەم (باندی مۆسیقا)یە زانیاری خۆی بنوسێت با ئەركی سەرشانی مامۆستا فۆاد رشید زۆر نەبێ چونكە هێشتا ماویەتی.

لام وایە لەدوای ساڵی 1930یش كە مێژوەكەی بەتەواوی نازانم لەم جێگا سینەمایەی ئێستاكەی سیروان كاك فۆادو تاقمە مامۆستایەك چیرۆكێكیكەیان تەمسیل كردو لەو بارەیەشەوە هیوام وایە كێ چی دەربارە ئەزانێت با بینوسێ.

لە ساڵی 1932وە 1933دا لە كۆیە لە پۆلی دوی ابتدائی بوم لەوێ چیرۆكی تەمسیلی (نیرۆن) تەمسیل كرا زۆر بەسەركەوتویی، وە لام وایە مامۆستایان عبدالله سامی وە خوا لێ خۆشبو عبدالرحمن شەرەف سەرپەرشتی‌یان ئەكردو بەم جۆرە دەستی پێ كرد: هەر بژی نیرۆن قەیسەری رۆمە! پایەداربێ خوایە سەروەری ئێمە!.. تكایە لەو بارەیەشەوە كێ چی ئەزانێ بینوسێت.

لە ساڵی 1935دا بۆ جاری یەكەم مامۆستایان فۆاد رشیدو حمە پاشای ئەورەحمان ئاغا لەبارەی تەمسیل و نیشی دەست و رەسم و پەیكەرتاشی‌یەوە تاوێكی بەتینیان كردە سەر هەستی قوتابیانی قوتابخانەی فەیسەڵی‌یە كە ئێستا كراوە بەبازاڕ لەبەر دەركی سەرای سلێمانی.

لەو ساڵەدا رەسم و نیگارو چوارچێوەی نیگار بەشێوەی رەنگاو ڕەنگ و بەدانەوێڵەو كەتیرە باوی پەیداكرد ئەو زستانەش هەر قوتابی بو خەریكی شێرە بەفرینەو دروست

نوسینی
رەفیق چالاك
بەغدا- 1972

کردنی شت و مەك بو لە قوڕە سور، لە هاوینیشدا چیرۆکێکمان تەمسیل کرد کە بۆ جاری یەکەم تیایا چومە سەر شانۆو ئەوری خزمەتکارێکم پێ سپێردرا.

ناوی چیرۆکەکەو دەرهێنان و ناوی نوسەرو ناوی هەمو نوێنەرەکان نازانم بەڵام ڕەسمێکی تێکڕاییی دوای تەواو بون گیرا، تکایە کێ لایەتی بۆمی بنێرێ تا ناوەکانیان لە دەرفەتێکی ترا بڵاوبکەینەوە، بزوتنەوەی هونەری ئەم سەردەمەی سلێمانیش ئەسپێرم بەهەردو مامۆستا فوئاد رشیدو حمە پاشاو چاوەڕوانی هیمەتیانم و با هونەری کوردیش مێژوی راستەقینەی ببێ بۆ دوارۆژ جێی کەڵکە.

لەو سەردەمەو پێش ئەو سەردەمەشدا تەمسیل کردن لەناو گەڕەکەکاندا باو بووە هیچ گەرەکێك نەبو تەمسیلی تیا نەکرێ لەلایەن منالانی گەڕەکەوە، لە گەڕەکی پیرمەسوری ئێمە برایان علی میرزا عارف، محمد مصطفی- حەمە بۆر- مصطفی عزیز، عمری سۆران، خوا لێ خۆشبو رەشیدی حەمە ئاغا، عمری قاوەچی، خوا لێ خۆشبو جەلال حسن حەمە سور، وە گەلێکی کەش بەم ڕۆژگارە خەریکی ئامادەکردنی کەل وپەل و رازانەوەی گەڕەك بوین.

لە ساڵی 1941دا لە دار المعلمینی ریفی دەرچوم و بوم بە مامۆستایەکی بچکۆلانەی خۆ بەزل زان لە قوتابخانەی مەلکەندی و لە دواییدا تەپڵی تۆپێن بۆ خالدیەو بۆ کانێسکان و بۆ هەرسێکیان و خۆلاسە لە دوای مردو رەحمەت باشەو دەستم کرد بەزیندو کردنەوەو بڵاوکردنەوەی سروده کوردی یە کۆنەکان لە قوتابخانەکانداو بۆ جاری یەکەم لە ژیانما ئاوازێکم دانا لەشێوەی سرودا بۆ شیعری خوا لێ خۆشبو زێوەر: تا دەست لە مل هیوا نەکەم...

بەم بۆنەیەوە وای بەباش ئەزانم جارێ ئەو ئاوازانە لێرەدا تۆمار بکەم کە خۆم دامناون و بائەوەشتان پێ بڵێم نەخۆم بەمۆسیقار دانـاوەو نەبەهونەرمەندیش و هیچ ئالەتێکی مۆسیقاش نازانم، بەڵام شیعرێ کە کارم تێ بکاو بمجوڵێنێ ئەهێنم لەوێنەی شیعرەکە، لە مەعناکەی لە ئامانجەکەی بەعیلمی ئاتەواوی خۆم لە گەنجینەی ئەو هەمو گۆرانیەی خۆمان کە لە منالیەوە بۆم دەور بۆتەوە هەڵ ئەهێنجم، ئەم بەرگی ئاوازە ئەکەم بە بەری ئەو شیعرەداو، هەتا ئێستا لای جەماوەری میللەتەکەشم خۆش بوەو شارەزاکانی مۆسیقاش زۆریان لاباش بوەو هیچ (بانقەنۆت)یشم لێوەرنەگرتون و وەریشی ناگرم و هەرچییەکم پێشکەش کردبێ دەستەبەرەیەکی بچوك و دیارییەکە لە کابرایەکەوە کە بەکوردی هاتە دنیاوەو بەکوردی تیایا ئەژی و، چی پێ کرابێ کە ڕێگەی درابێ دریغی نەکردوەو فریشتەی لای خواش نەبوەو، ئەوەندە بەسە پیاو بتوانێ لەناو کۆمەڵگایەکی وەکو کۆمەڵگای دەوری ئێمەدا توانیبێتی شتێکی باش بۆ خەڵکی بکات با هەرچی چۆنێك بوبێ، کە هەموتان شارەزان و ئەوەی شارەزاش نیە ڕۆژێك لە ڕۆژان لەهەمو شتێك ئەگاو ڕەحمەتێکمان بۆ ئەنێرێ.

خۆلاسە پیاو هەتا لە کاروباری گشتیدا ئیش نەکات، تێکەڵاو نەبێت، هەڵس و کەوت و مامەڵەی نەبێ، نەخوێنێتەوەو شەونخونی نەچێژێ، هەزار دڕك لە قاچی نەچەقێو هەزار چقڵ لە لەشی و هەزار پشکۆ بەدەستیا نەچزێ، بەندیخانەو ئەشکەنجەو سزاو بێ نانی و برسێتی نەبینێ و نەکەوێ و راست نەبێتەوە، نە تامی ئەرك ئەزانێ چییەو نەتامی ژیان و نە ناو جەرگەی خەڵکی و کۆمەڵگاو رژێم و دنیای سەردەمی پێگەیشتنی ئەم سەردەمەی ئێمە. لە 1940 هەتا ئێستا رێ ڕەوێکی ناڵەباری پڕ مەینەتی و کوێرەوەری و دەردو جەخارو کۆسپ و کۆستێکی ئەوتۆ بو لە هەمو بەشەکانی ژیانی کولە مەرگیمانا بەداستان نەبێ ناگێردرێتەوەو (دڵەش) هاوڕێی ئەو هەمو مەینەتی و کوێرەوەریانە سەبرا تو بی خوا تاوێکی تر مۆڵەتم بدەو مەوەستە با هەندێکی ئەو هەزاران ملیۆن هەندەی وا لە دەرونا بیخەمە سەر کاغەز. خەڵکینە! تکاتان لێ ئەکەم.. چی ئەزانن بیخەنە سەر کاغەز پێش ئەوەی لە چەرخی نەخۆشی(دڵا) دڵتان بوەستێ.

ئامانجم لە نوسینی ئەو ئاوازانەی بەهی خۆمیان ئەزانم ئەوەیە کە ئەویش نەبێ بە(فۆلکلۆر)، یا هەرجارە(یەکێك) بیکات بە هی خۆی وەك لەمەوبەر ڕوی داوە، یامنیش شتێکم لە بارەی هونەر و ئەدەبەوە بو(حساب) بکرێ و ئەمیش نەبێ بە خالانەی(سیاسەتە) کەمان کە هیچمان بۆ تیا حساب نەکرا، هەر چەندە لەسەر(ئەویش) ئەوەی پێمانکرا یا هەر دیزە بە دەرخۆنە بێ جارێ و ئەگەر بە بەرمانەوە ما هەڵبەتە ئەویش ساغ ئەکەمەوە و بە دۆ و بە دۆشاوەوە ئەیخەمە بەردەمی خەڵکی.

وەك وتم ئاوازی سرودی یەکەم بۆ هۆنراوەی خوالێ خۆشبو زێوەر بو- تا دەست لە مل هیوا نەکەم- لە ئەسڵی هۆنراوەکەدا ئەڵێ: تا دەست لە مل مەقسەد نەکەم، بەڵام من بە رازی بونی خۆی و ئاگاداری مامۆستای خوالێ خۆشبوم رەفیق حیلمی کە ئەو سەردەمە سەرۆکی(کۆمەڵی هیوا) بو، گۆڕیم بە هیوا بەو بۆنەیەوە و پێشەکی لە ماڵی خۆیان لەسەر زەوی دانیشتین و خوالێ خۆشبوی هاوڕێشمان فایق زێوەریشی لێ بو، ئاوازەکەم بۆ وت و زۆر شادمان بو وتی: بەڕاستی ئێمە پێویستمان بە ئاوازی حەماسی هەیەو، چاوی پڕ بو لە فرمێسك، هەزاران شکۆ بۆ ئەویش و بۆ هەمو ئەو هۆنەر و نیشتمان پەروەرە کوردانەی ڕێچکەی یەکەمیان بۆ شکاندین و هەر ئەوەندەم، لە دەست دێ و(وەفا) پێویستە و یاد کردنەوە پێویستەو دەستم بڕۆیشتایە پەیکەری ئاڵتونم لە جیاتی پرونز دروست بکردنایە بۆ عارف صائیب بۆ جەمال عیرفان، بۆ ئەسیری، بۆ مصطفی بەگی کوردی، بۆ نالی، سالم، حەمە ئاغا ی دەربەندفەقەرە، مەولەوی، بێسارانی، مەحوی، حاجی قادر، ئەحمەدی خانی، تاهر بەگ و ئەحمەد بەگی جاف، بۆ عبدالواحد نوری و زێوەر و پیرەمێرد و گۆران و رەفیق حیلمی و شێخ نوری شێخ صالح و ئەحمەد بەگی صاحیبقران و قانع و شێخ سەلام و فائق بێکەس و شاهۆی بیارە و نجم الدین مەلا و هەموو ئەوانەی حەرفێکیان بۆ ئەم نەتەوەیە بە کوردی خستە سەر کاغەز و، هەندێکیان لەرێی ئەو حەرفە راستەدا کوژران وەکو عارف صائیب و جەمال عیرفان و هەندێکیان لە برسانا مردن، وەك قانع، ئەوانی کەش بە ناسۆر و جەخار و دەمی پڕ لە زوخاوەوە سەریان نایەوە، ئەترسم ئەی وەتەن بمرم، ئەبینم بەختیاری تۆ، بنوسن با لە سەر قەبرم، وەتەن غەمگین و من غەمگین و حاجی مصطفی پاشا تۆش هەرگیز لە یادناچی و ئەی ئەوەی نوێی ئەم نەتەوەیە! وانێمە لە دڵمانا، لە هەستمانا، لە مێشکمانا لە خوێناومانا پەیکەرمان بۆ ئەو مەردانە دروست کردوە و ئەوەندەمان لە دەست هاتوە، ئێوەبن و وەفاداری، ئێوەبن و هەموشتێکی جوانی ناو ئەم دنیایە، ئێوە بن و شیری سپی و پاکی ئەم کوردستانە لە یادیان مەکەن، مێژوی ژیانیان بنوسنەوە ئاسارەکانیان، چاپ بکەن، سەر لە نوێ بە نوسین و کردارەکانی خۆیان زیندویان بکەنەوە، ئینجا

الجمهورية العراقية
وزارة الثقافة والاعلام
المؤسسة العامة للسينما والمسرح

المركز العراقي للمسرح
I.T.I



السيد رفيق جلال المحترم
بمناسبة الاحتفال بيوم المسرح العالمي التاسع عشر .. يسرنا
أن نقدم لكم [illegible] لاماني الغالية ..
حيث تتضافر [illegible] تجربتنا الرائدة من أجل
أن يكون [illegible] نهجنا الثوري
الاشتراكي [illegible] نحو بناء المجتمع العربي الاشتراكي
الديمقراطي الموحد ..

السكرتير العام
للمركز العراقي للمسرح
يوسف العاني

المدير العام
لمؤسسة السينما والمسرح
عبد الامير معلة

شارەکانمان پڕ کەن لە پەیکەرەکانیان و دڵنیاین لە مەردایەتیتان و شیرەکەم پێتان حەڵاڵە خوێنەکەم گەر گومنەکەن، نامداران و حەمییەت کاری ئەولادی وەتەن، بڕواتان ببێ هەمویان، هەمو ڕۆشنبیرێکی ئەم نەتەوەی کوردە:

هۆنەربێ، یانوسەر، یانیشتمان پەروەر هەمویان شەهیدن، ئەوانەی نەمان شەهیدن، ئەوانەی ماون (شەهیدن) بەڵام شەهیدێکی زیندو!

هونەرمەندان! نوسەران! هۆنەران، نیشتمان پەروەران، بەیەکابجۆشێن و ئاوێتەی یەك بن و یەك بگرن و خۆتان ڕێکخەن و کرمی ناکۆکی و دوبەرەکی و خۆویستی بپلیشێننەوە، بابەروبومتان بۆ میللەتەکەتان هەڵڕێژن و هەر ئەمەیە سەرەتای ڕێی پێشکەوتن و سەرکەوتن. قسە، قسە ئەهێنێ و منیش تۆزێ درێژدادڕم، ئاحەقیشم مەگرن ناتوانم لە جێی خۆیا قسەنەکەم و ئەوی سەبوریشم ئەدا لە ژیانا ئەو قسەکردنەیە.

قسەکردن نەبێ لەوانەیە پیاو توشی هەزار نەخۆشی تریش ببی و تەمەنیش بەرەوخەزان و نەمان ئەڕواو چاو بەرە ژێری هیچ لایەنێکیش نیم و ئاشلێم ئازاو قارەمانم بەڵام شەرتەو کردومە لەگەڵ خۆما لە ناهەقی بێ دەنگ نەبم وملیشم لە ئاستی هەقا لەمو باریکتربێ و هەرگیزا و هەرگیز سەناو خۆشەویستی و پشتگیری کرداری باش و پیاوی باش و شتی جوان و ڕاست ئەکەم، وە دژ بەکرداری خراپ و پیاوی خراپیش و ئاشبم بە(هیچ) فی النار فی السقرین با ببڕێتەوە ڕیاو پیاهەڵدانی درۆوبێ دەنگی، ئەوی لە دنیا لەتێ نانی بو، کەلاوە کۆنی ئاشیانی بو، پیاوی کەس نەبێ و کەس پیاوی نەبێ، هەر ئەو ژیاوە و، ئەو ژیانی بو... وا لە چەند ئاشێکم دا، بەڵام هێشتا ئەو ئاشەم نەماڵیوەتەوە کە بە خێرێ بۆی چوم و بابێینەوە سەر ئاوازەکان:—

ئەو سرودانەی ئاوازم بۆ داناون:

1-تا دەست لە مل هیوانەکەم.. هۆنراوەی زێوەر
2-سەدەی بیستەمە... بێکەس
3-ئەی ملەکەوە.... شیخ سەلام
4-گەرچی توشی ڕەنجەڕۆییی و... هۆنراوەی هێمن
5-ئازادی خوای کوردین ئێمە... هەردی
6-ئەوا هەڵکرا مەخشەڵی هونەر... هۆنراوەی وەشتی
7-جێژنە جێژنی کوردستانە... هۆنراوەی ع، شەونم
8-ئەی هەڤاڵانی ڕێگەی خەباتم.... هۆنراوەی وەشتی
9-بابە تاسەی دەرون...... هۆنراوەی شێرکۆ بێکەس
10-دەمی ڕاپەڕینە هۆنراوەی گۆران
11-کوردستان هۆنراوەی گۆران
12-ناوی خوای لێ ئەهێنم هۆنراوەی گۆران

وە هەندی سرودی کەش کە ئێستا نایەنەوە یادم چونکە هەرگیز یادداشتم نەبوە، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە و یادداشت پێویستە بۆ زۆرکەس.

جگە لەمە هەر لە منالیەوە هەمو سرودەکانی سەردەمی راپەڕینی کورد بە تەواوی فێربوبوم وە لەو سەردەمی مامۆستایەتی‌یەمدا زیندوم کردنەوەو نەم هێشت لە ناو بچن، وە لەم شوێنەدا سوپاس بۆ برامان کاك کەریم زانستی پێویستە کەئەو سرودانەی لە کاتی خۆیدا چاپکرد مەبەستم شیعرەکانە.

سرودەکانی سەردەمی راپەڕینی یەکەمی کورد لە سالی 1918دا زوربەی زۆری ئاوازەکانیان تورکی یان عەرەبین و بمتوانی‌یایە- کە تەسجیلم کری- هەمویم بخستایە سەر شریت و بمانایەوە بۆ دوا رۆژ و ئەمیشمان لەسەر خوا!!

ئەوی ئەمەوێ بیلێم لێرەدا ئەوەیەکە سرود-نشید- بە هۆنراوەی نیشتمانی و بە ئاوازی حەماسی تاوێکی گەورە ئەکاتەسەر دەرون و هەستی خەلکی. من بڕوام وایە کە زیندوکردنەوەی سرودە کۆنەکان و ئەو سرودە تازانە و، ئیدراك بەرزکردنەوەی قوتابیان لە قوتابخانەکانداو کردنەوەی کتێبخانەی روناکی و بیری نوێی پارتی و شیوعی و هاتنەکایەی کارکردنی پارتایەتی و لەوەبەریش خۆیبوون و هیواو مەخشەلی ئەو دیوی ژ. ك و لە یاری ئەو رۆژەی دوای جەنگی دووەم و ژیلەمۆی ئەکوژاوەی رابوردوی ئامانجی لە ئەشك و خوێنا داگیرساومان بونە هۆی هەلچون و راپەڕینەکانی 1945 و1947و ئەبێ هەموو کردار و کارێکی هەموو تاقم و چین و دەستەیەکمان لە هەموو گۆشەیەکی ژیانمانا بەرە و یەك ئامانج بڕوا کە خزمەت کردنی ئەتەوەکەمانە، کە وریاکردنەوەیەتی، کە پال پێوەنەریەتی بۆ چەسپاندنی هەقی رەوا وەك میللەتێك لەم میللەتانەی روی زەوی.

لە دەوری منالی ئێمەدا بەرۆژ کەوشەك و ئاشەبەتەنورێ و قەلەمرداریێ و سێ بازو هۆکی و تۆپێن و شەقێن و ئاگرەسورەو، مەلەی حەوزی توی مەلیك و قلیاسان باوبو، تەمسیل و جلوس بۆ ئێواران لە گەڕەکەکاندا، هەندێ جاریش شەڕەگەڕەك: منالی گەڕەك! سەربنە خەڕەك وەرنە دەرێ بۆ شەڕە گەڕەك!! لە شەڕە گەڕەکدا کەس نەئەگەیشتە مەلکەندی، ژن و پیاویان بە بەرد و قۆچەقانی و کوتەك و(لیس) شەڕیان ئەکرد و جارێکی کە نەیبینینەوە، بە شەویش جگە لە شەوانی زستان کۆ ئەبوینەوە بۆ ئەوەی لە بدایەتی مالی حاجی حەمە ئەمینی چایچی‌یەوە لە پیرمەسور شۆڕببینەوە بۆ بەردەمی مالی سید مجید و و سواغاو بە گۆرانی وتن بکەوینە ناو کۆلانەکانی سلێمانی و دەنگمان لێ هەلئەبڕی: دیسان هەلخریا سێدارە بۆمن! خانم رجای کرد، بی بەخشن بەمن، هەی هەی لە دلەکەم چەندە بێ عارە، هێشتا بە تەمای ژنی میردارە و لە هەزار ئاشمان ئەداو ئاشێکمان ئەئەمالیەوە شەوانی زستانیش حکایەت بو، قسەی خۆش و شەوچەرەی لەتکە هەرمێ و مێوژو هەنجیرو باسوق و سجوق، پێش ئەم سەردەمی ئێمەو لەدوا رۆژانی تورکاو لە سەرەتای داگیرکردنیشدا ئەم بەکۆلان گەڕانی شەوە هەر هەبوە و ئەوی بۆ ئێمەیان ئەگێڕایەوە دەنگە داودی‌یەکەی باشترین و بە ناوبانگترین گۆرانی بێژی سلێمانی خوالێ خۆشبو(ئەحەی ناسر) بوە، بە بڕوای من زۆربەی ئەو گۆرانیانەی ئێستا بەفۆلکلۆر دانراون هی ئەون، بێ ئارامی، دادەنگ، هەی نار، قەتار و ئەللاوەیسی و خاوکەر و خالەی ڕێبوار و سەوزە، خۆلاسە ئەتەسجیل هەبو، ئەخوێندەواری ئاشنای هونەر کە ئەوکردارە هونەریانە تۆمار بکات، بەلام دلم بەوە خۆشە کە گەلێك کەس لەوانەی لەو سەردەمەدا (ئەحەی ناسریان) ناسیوە هێشتا شوکر ماون، بەلکو ئەمە خوایە بجولێن و روناکی یەکمان بۆ بدەنە بەر ئەو گۆشە تاریکە و ئەوی ئەیزانن لەو سەردەمە بینوسن، ئەوی جێگەی داخیشە ئەم هونەرمەندە بەناوبانگە بە دەستی یەك دوو مێشك پوت و بە خەنجەر لەبەر حەوزەکەی ناو بازاڕا کوژراوە چونکە لەو رۆژەدا ئەمیش خاوەنی بیروڕای خۆی بوە و هەقی وتوە و قسەی لەکەس نەخواردۆتەوە هەقوایە لەو شوێنەدا پەیکەرێك بۆ ئەحەی ناسری شەهیدی هونەرمەند و ئازا دروست بکرێت. هەر لەو سەردەمەدا ئەلێن کە مەلا ئەحمەدی خوالێ خۆشبوی باوکی کاك حەمە صالح دیلان و قادر دیلان یەکێك بوە لە دەنگ خۆشەکان و خوالێ خۆشبوش(رەفیقی گلە)، بالێرەدا ئەوەتان پێ بلێم کە باوکم رەفیقی ئەحەی ناسر و(رەفیقی گلە)بوە لە سەردەمو تافی لاویداو لەبەر خۆشەویستی منی بە ناوی رەفیقی گلەوە ناو ناوە و، بەداخەوە ئەیلێم کە هەتا باوکم لە ژیانا بو من لەبەر کەلکلەی سیاسەت و منالی ئەو ئیدراك و دور بینیەم نەبو کە زانیاری دەربارەی ئەو دوو هونەرمەندە لەوەوە وەر بگرم و چاوەڕوانم خەلکی خێرخوا بجولێن و بنوسن.

بێینەوە سەر دەنگ خۆش و شارەزای گۆرانی‌یە دلدارییە فۆلکلۆرییەکانی ئەو سەردەمەی خۆمان، کاك علی میرزا عارف نەك هەر تەنیا نوێنەرێکی چاك بو، بەلکو قسە زانێکی باش و نوکتەچی‌یەکی چاك و دەنگ خۆشێکی باشیش بو، بەلام داخەکەم ئێستا تەریکە و نازانم بۆ؟! دوای ئەم (حەمە)-محمد احمد- هات کەوا بزانم ئێستا تاجری ریخۆلەیە مامۆستا ئەحمەد هەردیش شارەزای هەمو ئاوازەکان بو جگە لە بەهرەکانی کەی وشەوەهای شەومان بە یەکەوە پال پێوەناو سال بە دوای سالا وائێستا ئەو نەخۆشی سنگ و من نەخۆشی دل و زۆربەی تەمەنمان بەیەکەوە بردە سەرو داوای لەش ساغی بۆ ئەکەم. بێ گومان پێویستە دوای ئەحەی ناسر ئێمە کاك رەشید-رەشۆل- ی خۆشەویستی شێخ مەحمودی ئەمر و هەموو کوردێك کە ناسیبیەتی لە یاد ئەکەین، چونکە ئەو بەرزی گۆرانی وتنەی بەوەوە هەیە هەتا ئێستا گۆرانی بێژەکانی لای ئێمە-سلێمانی- ئەی گەیشتونەتێ و هیوام وایە خۆی یادداشتی خۆی و مێژووی ژیانی بنوسێ یان کۆمەلی هونەر و وێژە ئەو ئەرکە بگرنە سەر شانی خۆیان و هەموو گۆرانی‌یەکانی بۆ تۆمار بکەن بەیارمەتی تیپی مۆسیقای سلێمانی، ئینجا مەلا کەریم و دایکی جەمالیشمان بالەبیر ئەچن.

دوای ئەمان کاك مەحمودی توفیق شلك وبرا جوانەمەرگەکەی دێ کە قادر توفیق گورجی بو کە کەس ئینکاری دەنگ و ئەدای هونەرمەندانەیان ناکات، پاش ئەمان کاك ئەحمەدی شارەوانی ئەهات، ئینجا کاك(محمد صالح دیلان)، سۆز و تام و لەرینەوەیەك کە لە قورگە ئالتونیەکەی حەمە صالح دا هەیە پۆپەیە لە گۆرانیدا و ئەو سەردەمەی ئەویش گیانێکی زیندوی بە گۆرانی کوردی بەخشی و حەمە صالح هەر تەنیا گۆرانی بێژ نییە بەلکو خوێندەوار و رۆشن بیر و ئاوازدانەرو هۆنەرێکی باشیشە و ئەوی لێی داوا ئەکەم ئەوەیە نە واز لە ئاواز، نە واز لە ئەدەب ئەهێنێ و لە کونجی گۆشەگیری بێتەوە دەرێ و دەربارەی باوکی و ئەو دەورەی باوکی پێش و پاش ئەوەش ئەوی ئەیزانێ بیخاتەسەر کاغەز و با ئەوڕاستی یەمان لە بیربێت کە بەرو بومی ئەدەب زۆر گەورەترو پایەدارتر و ئەمرترو کاریگەرترن لە بەروبومەکانی کە پێ راتەکێنە حەمە صالح، وەرەوە کۆڕ و

میللەتەکەت پێویستی پێتەو زۆرت پێ ئەکرێ براله، ئینجا کاك قادری حاجی حسین دێ کە ئەویش دەورێکی هەبو.

هەر لەو سەردەمەدا کاك(محمد محمود قادر) وەك فریشتەیەکی دەنگ خۆشی نایاب هاتەسەر شانۆی هونەر و ئەو گۆرانی یانەی ئەو ئەیوت هەزار ئاخی لەدوا هەڵ ئەکێشرا و ئەمیشمان(حسابات) وڕی کردو شانۆی هونەری بەجێ هێشت، بەلام ئێستاش کە تۆزی دەرفەتی ئەبێ خۆشترین شت لەلای گۆرانی‌یە، بێ گومان نابێ شێخ تالبی شێخ حەمە غەریبی دەنگ پڕ لە سۆزیشمان لە بیربچێت هەر چەندە ئەو بۆ ئارەزوو ئەبێ هەرگیز گۆرانی نە ئەوت و ئەویش بەزۆری بۆ برادەرانی زۆر خۆشەویستی و کە خاوکەریشی ئەوت ئەیبردیتە دنیایەکی ترەوە. وا لێرەشدا شێخ نوری شێخ صالحم هاتەوە یاد و بە پێویستی ئەزانم کە بڵێم شێخ نوری ئەمر تەنیا هۆنەرێکی بالا نەبو بەڵکو لەریزی یەکەمین هۆنەرە تازە کارو باوەڕ پێشکەوتوەکانی کورد بو، پێش مامۆستا گۆران بو لەو رێ رەوەدا، یەکەمین هۆنەرە کە نۆپەرێتی داناوە بە هۆنراوە و ئاوازەوە، یەکەمین ئاوازدانەرە بۆ زۆربەی هۆنراوەکانی خۆی، هۆنراوەی ملاحم لەمەوە دەستی پێ کردوە، پێش ئەحمەد بەگی ساحیبقرانی ئەمر لە سەردەمی تازەدا، دەنگ و ئاوازێك کە بە شێخ نورییەوە بو بەردی ئەکرد بە ئاو.... دڵدارییە ناکامەکەی ناسۆرە لە جەرگی منا، کە بۆی گێرامەوە لە شەوێکی دور ودرێژی زستاناو دوویەدوو لە یانەی فەرمانبەرانی سلێمانی و گۆرانی یەکەی(عەزین)ی برای بۆ وتم خۆم پێ نەگیرا و منیش گریام و قورم پێوا: **لەوێ دیجله وەکیلی دیدەکەی من بو بە لێلی وسور/ سکوتی خەستەخانەت بو بە شینی عائیلەی رەنجدر/ ئەمە داخێکە جەرگم کون ئەکا تا ڕۆژی نەفخی صور/ عەزیزم ڕۆ، عەزیزم ڕۆ، عەزیزی ئەو نیهالم ڕۆ!** ئەگەر لێرەدا بکەومە پەڵ هاویشتنە کوڕەکانی و کاك رشدی برازاشی کە هەتا ئێستا دیوانەکەیان چاپ نەکردوە ناهەقم مەگرن و تەنیا (وەفا)، وا منیش لێتان بێ دەنگ ببم ئەی ویژدانی خۆتان، ئەی میللەتەکەتان، پێ راتەکێنن وا ئێوەش پایزی تەمەنتانە.

بابێمەوە سەر (ئەخۆل) ئەو هۆنەر و دەنگ خۆش و باوکی ئاوازی پڕ لە هەنسك و قوڵپی گریانەی لە قوڕگ و جەرگ و دڵی بریندارەوە جاران ئەهاتە دەرێ، ئەو کەسەی بەبێ دەنگی و بە هێمنی ئەژی و هەرگیز حەزی لە خۆ دەرخستن ئەکرد وەك خەڵکی کەو لەسەردەمی ئێمەدا (پەیمان و شیوەن)ەکەی بە ئاوازەوە بلاوبوەوە و هەمو خۆشمان ویست و هەتا ئێستاش: **شەرتە تا ڕۆژی حەشر خولیای من بێ چاوی یار،/ وێڵی سەحرابم هەمیشە تەرك بکەم خوێش و دیار،** تۆش ئەخۆل گیان هۆنەر و هونەرمەندی و بڵێین چی کە بەختی رەشمان، کە زەمانە و دەورو کۆمەڵگاکەمان نەیکا و هەزار رەحمەت لە مەحوی:

**قەزابێ دەسەلاتت کا، چی‌یە غەیری رەزا چارە،/ لەبەردەستی جەللادا رێوی ێکە (شێری پەل بەستە)!**

من لەکاتێکدا کە ئەم بیرەوەریی‌یە، یان ئەم چەند (یادە) دەربارەی هونەر ئەنوسم و ناوی هەندێ لەمامۆستایان و برایان ئەبەم ئامانجم ون نەبونی هەندێ راستی‌یە بۆ سبەینێ و ئەگونجێ هەندێ کەس لەوە عاجز بێن کە بۆ ناوم نەبردون، با ئەم لایەنە رون بکەمەوە: پیاوێك رەسم ئەگرێ، لەو رەسمەدا هەمو شارەکە، بەهەمو گۆشەیەکیەوە و بەهەمو زەمانێکیەوە و بە هەمو یەکێکیەوە دەرناکەوێ.

ئەوەی بۆ من دەرکەوتوە و پەیوەندی بەو دەورەی منەوە بوە یازانیاریم دەربارەی هەبوە لەوە ئەدوێم، هەر ئەوە ئەزانم و شەڵڵا هەموو یەکێکم بناسیایە و هەمو شتێکم بزانیایە و بڵێم چی، بەلام هەمو کەسێکی کە بۆی هەیە هەرچی‌یەك ئەزانێ با بینوسێ و بۆمانی بنێرێ تاوەکو لە دەرفەتێکی ترا بلاوی بکەینەوە، لەلایەکی کەشەوە با هەمو کەسێك دڵنیابێ کە لە ڕۆژانی داهاتودا و تا بە بەرمانەوە ماوە چی ترم زانی و چی ترم بەبیرا هاتەوە هەر ئەنوسم، لام وایە ئنجا با ئاوازی گۆرانی‌یە (دڵداری)یەکانیشم تۆمار بکەم هەر بۆ مێژو:

ئاوازە دڵدارییەکانی دام ناون:

1-دیالۆجی تەمسیلی گوڵی خوێناوی هۆنراوەی گۆران.

2-ئەی چاو چەشنی بازی قەفەس.. هۆنراوەی گۆران.

3-قژکاڵی لێوئاڵی پرشنگی نیگاکاڵ.. هۆنراوەی گۆران.

4-یار یار ناسکۆڵەی نازدار.. هۆنراوەی گۆران.

5-بۆ گوڵی لاولاو.. هۆنراوەی گۆران.

6-دوا سەرنج.. ئەی قژ زەرد.. هۆنراوەی گۆران.

7-بڵێن بەیار... هۆنراوەی گۆران.

8-بەنوری بادە کەشفی... هۆنراوەی مەحوی.

9-دیارم دێری عەشقە.. هۆنراوەی مەحوی.

10-بی بێێ یانەی بێێ... هۆنراوەی مەحوی.

11-کە دیم ئاڵۆزە چاوی... هۆنراوەی مەحوی.

12-دوو ئاوانەکەی شوێن ماڵە گەورە... هۆنراوەی پیرەمێرد.

13-ئەی دڵ تۆ دڵەی جارانی من.. هۆنراوەی رەمزی مەعروف

14-نۆپەریتی دڵداری کوڕە شوان.. هۆنراوەی کامەران.

15-دڵم هەر ئەو دڵەی جارانە لەگەڵ لەتاو جەورەی زەمانە و خەم... هۆنراوەی ئەخۆل.

16-من بوم مشتەری خاڵ بێ... هۆنراوەی مەولەوی

17-مردنە بێ تۆ ژیانم... هۆنراوەی شێخ سەعیدی حەفید.

18-ئەی دەرونی ناو گێژاوی... هۆنراوەی شێرکۆ بێکەس

19-گەڕانەوە...شیرینەکەم... هۆنراوەی شێرکۆ بێکەس

20-پاڕانەوە... خاکی بەرپێتە...هۆنراوەی ئەخۆل

21-لای‌لایە... رۆڵە لای‌لایە... هۆنراوەی وەشتی

ئەمە ئەوانەی بەبیرما بێتەوە لەم کاتەدا، بەم بۆنەیەوە با ئەوەش بڵێم کە هۆنراوەی روخسارو روت گرژمەکە برا هەژارەکەم، هی منەو ئاوازەکەشی عەرەبیە(علیك منی السلام یا ارض اجدادی).

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ دەوروبەری ساڵی 1942، کە وەك وتم: کرابوم بە مامۆستایەکی گەڕۆك و سیاسەتم پێ ئەکرا لەبەر سیاسەت!!

لەو ساڵەدا و لە هەمو پۆلێکی قوتابخانەکانی مەڵکەندی و خالدیەو گویـژەدا، کە دەرسێك تیایا هەبوبێ، کتێبخانەیەکی بچوکمان لەگەڵ قوتابیەکانی ئەو ڕۆژە وپیاوی ئەمڕۆدا تیا دروست کردو، ئینجا وتووێژ دەربارەی مەسەلەی نەتەوایەتیمان و، سرود بەدوای سرود و هۆنراوەی نیشتمانی ئەو سەردەمەو،باسی هۆنەری جوان و، خۆلاسە بورکانێکی داگیرساوبوم. سکرتێری کۆمەڵی هیوا.

لەم سەردەمەدا ئەڵمانیا تەنگی دنیای لە ئینگلیز هانیبوەوە یەك، ئەم ئینگلیزەش کە لە ساڵی 1918وە سەواو مامەڵەیەکی پڕ لە تەڵەکەو فێڵ

وگرێ و دەست برین، لەگەڵ ئەم کوردەدا ئەکات هەتا ئەمڕۆ، ئەڵێن ئائەم ئینگلیزە بە حورمەتە کە ئەکەوێتە باری ترسەوە، وەرە تەماشای کە! ئەوە قسەی خۆشەو، باسی هەقی چارەنووس و، دڵنەوایی و پڕۆژە دانان و، پارە هەڵڕشتن و ئێکسکیوزمی!! بەڵێ بەلوتفە داگیرکەری لێ قەوماو، دەستی پڕ لە پارەیەو، دەم بەپێکەنین و، بەڵێن بەخەربار!! کە تۆزێ کێش دەستی بو دوژمنی ئیمانتان بێ: هەڵ ئەگەڕێتەوە و روگرژئەکاو دەم ئەئوقێنێ و پەشیمان، لە هەموو قسەو وعدو بەڵێن و پەیمان! لەو رۆژەدا ئەم ئینگلیزە ئیشی بەکورد هەبوو، مەسەلە نزیکەی18ملیۆن کوردە لە عیراق و سوریا و توركیاو ئیران و یەکێتی سۆڤێت، بۆ لەگەڵیانەبێ هەتا کار مەیسەرئەکات؟

داوای پێنج کەسیان کرد کە بچن بۆ فەلەستین، بۆ ئیستگەیەکی کوردی کە لەوێ بۆ کورد ئەکرێتەوە لە شاری یافا.

ئەو حەلە کۆمەڵی هیوا گەورەترین پارتی بو لە کوردستانا، لە ئەندامانی ئەم کۆمەڵە چوارکەس تەرخان کرا بۆ ئەم ئیشە:

کاك نوری شاوەیس، ئەنوەری مەلا حەمە ئاغا، ئیبراهیم گوردی و رەفیق چالاك.

بەڵام لەبەر ئەوەی برایانی ناوبراو هەرسێکیان لە پێش منەوە بوبون بە سیاسی و(شتیان) لەسەربو، حکومەتی عیراق تەگەرەی خستە ئیشەکەیانەوە و نەیهێشت ئەوان بێن، لە ئەنجاما برایان رەمزی قەزاز و عبداللە گۆران هێنران و کەوتینەڕێ بەرە و بەغدا.

کەچومە بەغداو دەستم کردە ئامادەکردنی ئەوراقی پێویست و لەم لاشەوە ئیستقالەم کردوە لە مامۆستاییی و قبوڵ کراوە(قبر) پێمەوەنوسان!!

-خێرە؟

-خێری چیی؟ تۆ(نازیت)!!

-کورە دایکتان چاك، باوکتان و باپیرتان چاك نازی نیم کوردم!

خولاسە درێژەی نادەینێ و، ئەمیش بابمێنێ بۆ وەختی خۆی و، بە قودرەتی قادر کرام بە رەفیق توفیق اسماعیلی موسلاوی، و تۆزێکی مابو بمێنێن بۆ(فاو)، وە لە وێش رزگار بوم و، بروا ئەو رۆژە و ئازیەتی و ئینگلیزو ئەیەنەوە.

کە گەیشتینە(یافا) لە فەلەستین و، ستۆدیۆمان بۆ دامەزراو، جێ و رێمان بۆ دیاری کراو، ناوی ئیستگەکەمان نا(کوردستان)، دەستمان کرد بە ئیش و مەردانە بە هەرسێکمان توانیمان لە هەموو گۆشەکانی ژیاناو، بە هۆی ئەو ئیستگەیەوە خزمەتی ئەتەوەکەمان بکەین و ئەمیش بابمێنێ بۆ وەختی خۆی چونکە دورودرێژە و زۆر ئاو ئەکێشێ.

لەو ماوەیەدا (ئاغستۆسی 1942- ئاغستۆسی 1945) سودێکی باشم وەرگرت لە ژیانما و بەتایبەتی لە بارەی هونەرەوە.

جارێ هەر لە ئیستگە، هەمو مۆسیقاژەن و، گۆرانی بێژەکانم ناسی و بوم بە هاوڕێیان، بەتایبەتی (محمد عبدالكريم) کە ئەمیری بوزق تەنبور- بو لە هەمو عالەمدا و بە رەسەنیش ئەگەڕێتەوە بۆ سەر کوردەکانی دیاربکر، ئەم کوردە کراوە بەئاردی ناو درکان بۆ هەر وڵاتێك ئەچی و ناودار ئەناسی، لەدواییدا بۆت دەرئەکەون کە زۆربەیان کوردن.

هەر لەو سەردەمەدا خۆم خەریك کرد بە فێربونی مۆسیقاوە بەنۆتە، ئالەتێکی (ماندۆلین)م کڕی و مامۆستایەکی یۆنانیم راگرت، بەڵام لەبەر کەڵکەڵەی سیاسەت و ئیشی زۆر و رابواردنیش وازم لێ هێنا.

هەر لەو ماوەیەدا مامۆستا محمد عبدالوهاب و یوسف وەهبی وبشارە واکیم و ئەحمەد سالم و زەکی سلیمان و فاخر محمد فاخر و حسن فائق و ئنجا ئەمینە رزق و سعاد محمد و لەیلامراد و ئەسمەهان و نادرەی(امیرة الطرب) پشمان دی لەگەڵ گەلێکی کەشدا کە ئەهاتن بۆ ئەوێ: بۆ تەمسیل کردن و گۆرانی وتن و رابواردن و، لەگەڵیانا کەم و زۆر دانیشتم و، بۆ هەموو ئاهەنگەکانیان چوم و سودێکی باشم وەرگرت لە ئیخراج و تەمسیل و ئیلقاو دیکۆر و مکیاج و پێویستییەکانی کەو، زانیارییەکی خستیش لە خوێندنەوەو بینینی شوێنەکانی شارەکانی کەو لە ئاغستۆسی ساڵی 1945دا ئیستقالەم کردو بە فەلاکەت لەرێی ئەردەنەوە گەیشتمەوە ئەو بەغدایەی پایتەخت.

هەر لەو مانگەدا بو، یا لە ئەیلولابو لە ئیستگەی کوردی بۆ جاری یەکەم دامەزرام و قوم پیاکرد: ئێرە ئیستگەی کوردستانی عیراقە! لە دوای سێ رۆژ لێیان قەدەغە کردم.

هەرچی ئاوازێك کە لە(یافا) بە مۆسیقاژەنەکانی هاورێم(نۆت) کردبو بە مارشی قەومی کوردیشەوە دام بە برامان(جميل بشير) و ئەویش خوا سەلامەتی کا نازانم چی لێ کردن!

هەر لەو مانگەدا، ئەسرێکی شۆرشگێریم نوسیبو، بە ناوی(گۆرانی ئازادی چین) لە گۆڤاری گەلاوێژدا، هێشتا لە چاپخانە بو(بەرەحمەت بویەك) ئاشکرای کردو خەریك بون گەلاوێژ داخەن، بەڵام نەیانکردو تەنیا نوسینەکەی منیان لەو ژمارەیە دڕاندو خۆشمیان لە ئیستگە دەرکردو بومەوە بە مامۆستاو یەکسەر بۆ سورداش.

چومەوە بۆ سلێمانی و ئەوحەلە(چرۆی هیوا) لە غەرغەرەدا بو، تەماشامان کرد بێ سودە، لە ماڵی ئەو ساکەی ئەم کاك(رووف مەعروف)دا کە خاوەنی کتێبخانەی گەلاوێژە لە سلێمانی و یەکێکە لە نیشتمان پەروەرانی تاقمی دووەمی بزوتنەوەی کوردایەتی، کۆمەڵەکەمان هەڵوەشاندو، ئینجا لە ماڵی ئەم کاك نوری شاوەیسە چومە(پارتی رزگاری) و دوای ئەم بە مامۆستاییی ئێردرام بۆ قەمچوغەو بۆ جافەران و ساڵمان کرد بە 1946 و پارتی دیموکرات دامەزرا و کتێبخانەی کردەوە و، لیژنەیەکیشی پێکهێنا لە سەرەتای هاویندا بۆ قەلاچۆی نەخوێندەواری و گەشەدان بە بزوتنەوەی هونەری و پێکهاتبو لە:-

رەفیق چالاك بەرێوەبەری قوتابخانەو سەرەکی لیژنەی هونەر، وئەم برا بەرێزانە:

نوری محمد امين، طه محي الدين، فائق هوشيار، جمال امين بگ، كمال احمد بگ، عثمان مصطفى، رؤوف معروف، نوری امين بگ، محرم محمد امين، عثمان رضا، قادر مصطفى، عمر كريم.

لە ماوەی سێ مانگی هاویندا و لە قوتابخانەی گوێژە نزیکەی(350) برای کاسبی ناو بازارمان فێری خوێندن و نوسین و حساب کرد و بە بروای کوردایەتی گۆشمان کردن و باوەڕی پارتیمان بڵاوکردەوە و(بومە لەرزەی) یەکەمی پێنجوێنی بە سەردا هات و داوای(رێ دان)مان کرد لە میری: کە تەمسیلی (فی سبيل التاج) بە ناوی( لەرێی نیشتماندا) تەمسیل بکەین بۆ باربۆی لێ قەوماوانی ئەو شارە و رێمان پێدرا، لەیەك شەودا لە ئێوارەوە هەتا رۆژهەڵهات لەسەر زەوی و لەبەرچرایەکی ئەوتی سێ نمرە!! چیرۆکەکەم گۆڕی بە کوردی و خستمە دەقی وت وویژەوە حوار-، هەر بۆ ئەو بەیانی یەو بەبێ نوسین چوم بۆ قوتابخانەی گوێژەو



**وێنەی بەشدارانی( لەرێی نیشتمان ) و( گوڵی خوێناوی ) و ( دوكتۆر پەراسو )**

لە ڕاستەوە بۆ چەپ، ریزی یەكەم: برایان عبدالله سالار، حەمە صالح دیلان، ریزی دووەم: خوالێ خۆشبو ئەحمەد هوشیاری خەیات، كاك عبدالله ابراهیم، لاوی خێر نەدیوی خوالێ خۆشبو حەسەن توفیق، رەفیق چالاك، محمد احمد طه(كامەران)، شێخ رمزا گولانی، كەمال محمد امین، رشدی ئەحمەد بەگ، فائق توفیق.

ریزی سێیەم: شێخ نوری شێخ جەلال، قادر مصطفی، عوسمان رەزا، جەمال امین بەگ، كەمال ئەحمەد بەگ، نوری محمد امین، فائق هوشیار، نوری شاوەیس، نوری امین بەگ، عوسمان مصطفی، طه محی‌الدین، محرم محمد امین، عمر كەریم.

ریزی چوارەم: محمد امین ئەگلی، حەمەی بەكر، رووف مەعروف، امین شوكت، نوری غفور، قادر دیلان، حسن فەلاح، حەمە بۆر(محمد مصطفی) ،توفیق حسن ئاغا، جەمال عبدالله، عەزیز حاجی قادر، ئەحمەد دەرویش دادی، غەفور رەشید، وەلەلای پەنجەرەكەوە كاك بەهجەت رەشید.

برادەرانم هەڵبژارد و پراوەم پێكردن، هەر ئەو رۆژە كاك(حەسەن فەلاح)ی هونەرمەندمان هێنا و چۆنیەتی پەردەكانمان بۆ باسكرد و دەستی كرد بە دیكۆر و پەردەی شەوی سامناك و گوڵی خوێناوی خەڵكەكەی سەرسام كرد.

لەلایەكەوە پراوە، لەلایەكی ترەوە تەرتیباتی شانۆ دروست كردن، بلیت چاپكردن، كورسی هێنان، شوێنی چایخانەو ساردەمەنی، لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی خەڵكەكەشدا بە هێمنی و لەسەر خۆیی هەمومان تەشریفاتی بوین و رێگاپیشاندەر و كەسمان لە هیچ ئیشێك لاری نەبوین و هەموو بەقسەی یەكمان ئەكرد و هەركەسە ئەركی سەرشانی خۆی بە زیادەوە ئەكرد و بژین: لاوە خوێن گەرمە دڵسۆزە لێ هاتوەكانی ئەو سەردەمە و پیاوانی ئەمڕۆ كە كاری مانگێكیان بەرۆژێك و ئیشی سەد كەستان بە دەپانزەكەس تەواوكردو هەتا ئەمرم كرداری پیاوانەی ئەو سەردەمەتان فەرامۆش ناكەم و سلاو رێزو خۆشەویستیم بۆ هەموو یەكێكتان لە هەر كوێ یەك هەن و هەرچی یەكن، بە پێویستیشی ئەزانم كە لە دوای ئەحەی ناصری نەمر ناوی كاك(حسن توفیق)ی جوانە مەرگ و (ئەحمەد هوشیار) وەك دوو شەهیدی كەی رێبازی هونەری كورد لەم شوێنەدا بنوسم بۆ مێژوو، سلاو لە یاد و دیارتان برا خۆشەویستەكانم.

هەر لە پاڵ ئەو كاروبارانەداو لەو رۆژە پڕكارو ئەركەدا دەورەكانی دیالۆجی گوڵی خوێناویم دابەش كرد بە سەر كاك محمد صالح دیلان، و كاك محمود محمد قادر داو، دەوری كچەش لەسەر شانۆ بە كاك عبدالله رشید(سالار).

لە هەمانكاتدا تیپێكی مۆسیقای ساكارمان بە یارمەتی برایان دروست كرد لە كاك ئەنترانیكی مەی فرۆش كەمان، جەمال عبدالله عود، بەهجەت رشید عود، شوكت رشید كەمان، قادر دیلان تەپڵ، هەر لەورۆژەدا كاك محمد مصطفی(حەمە بۆر) پەردەیەكی پێكەنینی ئامادەكرد، یا(دوكتۆر پەراسو) بو، یان (دۆمەكان).

پرۆگرامی شەوانەمان بریتی بو لەووتار و هۆنراوەی(بوكی ون بو)ی خوالێ خۆشبوو فائق زیوەر، گۆرانییەكی كاك حەمەی بەكر، چیرۆكی لەرێی نیشتمان، دیالۆجی گوڵی خوێناوی بە تەمسیلەوە، پەردەی پێكەنین.

هەموو یەكێك لەو برایانەی بە شداری ئەو هونەرە جوانانە بو دەوری خۆی زۆر بە سەركەوتوویی ئەداكردو چەپڵەو تەقدیر مەپرسەی ناو بو.

هەر چەندە شەوێ سەعات چوار ئنجاچووینەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام سەركەوتنمان هەموشتێكی تری لەبیر بردبووینەوە، لە ماوەی حەوت

ڕۆژدا(دووهەزار) دینارمان زیاتر کۆکردەوە لەو حەوشە بچوکەدا و لە دامێنەوە(وێنە)کەی دوای ئەو ئاهەنگانە ئەبینن بە شەرحەوە.

لە ئەیلولی 1946دا، هەر ئەو دەستەیە، داوامان کرد، کە بۆ ماوەی هەفتەیەك لە هەولێریش تەمسیل بکەین، بۆ باربوی لێ قەوماوانی بومەلەرزەکەی پێنجوێن و ڕێمان پێدراو، دیکۆر و کەل وپەلمان پێچایەوە و، ڕێمانگرتە بەر، بەرەو هەولێر، لام وایە یەکەم کۆمەڵی هونەری کوردبوین، کە بۆ جاری یەکەم شارە و شارمان کرد، لە هەولێر هەڤاڵانی پارتی هەموو تەرتیباتێکیان بۆ کردین و لە قوتابخانەی یەکەمی(ابن خلكان) کە بەرامبەر یانەی فەرمانبەران بو، شانۆمان دروست کردو، بلیت دابەشکراو، کورسی هێنراو، جێی نوستن هەر لەو قوتابخانەیەدا و لە سەر زەوی جێبەجێکرا، ئەو ڕۆژە هەموومان(خاکی)بوین و بەبێ(غەڕاییی و غرور)، بۆیە هەموو کاروبارێکمان، بە جوانی و ڕێك وپێکی ئەچوەسەر، ئەوی هونەرمەند ئەکوژێ ورسوای ئەکات: من منی و تۆتۆی و غەڕاییی و ڕەوشت نزمی یەو، با ئەمە سەر مەشقی هەموو هونەرمەندێکی ڕاست بێ‌و کارپێکردنی لە هەموو کات وشوێنێکدا، سەرکەوتنە و خۆشویستن.

لە هەولێر توشی هەندێ ناخۆشی بوین، یەکەمیان هەندێ لە برادەران فێری(گەڕان)بون، هەندێکی‌کەیان خەریکی سەرکێشی‌بون، ئەمانەمان زوو چارەسەرکردو، بۆ چاودێری و حساب لیژنەیەکمان دامەزراند بە سەرکردایەتی کاك عثمان مصطفی.

برادەرێکمان لێ پەیدابو، ناوی(ڕەشەبا) بو، لە پولیسخانە ئیشی ئەکرد، ئەمیش خوا سەلامەتی کا زۆری هێناین وبردنی و بەم زمانە لوسەی خۆم نەبوایە خوا لە کاری خۆی ئەبوەوە و تەمسیل نەئەکرا، ناهەقی کاك ڕەشەباش ناگرم نانی لەوە ئەخواردو، دنیاکەی وابو، ئەویش ئەگەر خوا نەخواستە نەماوە، بارەحمەتی لێ بێ، خۆ ناشوکری نەبێ: قەد ئێمە بەبێ(ڕەشەبا) نەبوین!!

ناخۆشی‌یەکی تر ئەوەبو: دو ئاغا، مرخێش، مرخێش (حەزیان) لە جوانی بێ ناو کردبو، خەریك بو یەکتری کەللە پاچەکەن! ئەمیان ئەیویست بی هێنێ و هی خۆیەتی و؟! ئەوی کەشیان(وەر وەری) هەڵ ئەکێشاو، خوازبینیش لە من ئەکرا، دەوەرە ئنجا لە(ئاغایان) بگەێنە کە کچ نییەو پیاوە و هەتا کاك عبدالله سالارمان ڕزگارکردو(قتل وقتالمان) وەستان قیر وتی چەق، خۆلاسە ئەم چەند شتەو چەند شتێکی تر کە نامەوێ باسی بکەم ناخۆش بون بەڵام ئەمانە هەر ئەبێ و مەسەلە کۆمەڵگایەو پێ‌گەیشتن، منالی وکەم تەجروبەییی و بڕواتان ببێ پیاو تەنگەچیکەلانە نەبێ چار بۆ هەمووشتێك ئەدۆزێتەوە.

پرۆگرامی هەولێرمان جیاوازبو لەگەڵ پرۆگرامی سلێمانیدا، لێرە برای خۆشەویستمان کاك احمد حاجی صالح قاسم دەوری برامان کاك کەمال محمد ئەمینی دی لەبەر نەخۆشکەوتن، لە تەمسیلا، لە گۆرانی و مۆسیقادا، لە هەمووکارێکی هونەریدا، بۆهەموو دەورێك، گەورە یا بچوك، ئیحتیات(جێگرەوە) زۆر پێویستەو با پێتان بڵێم بۆ؟

پارتایەتیشدا، بەیەکێکەوە ئەنوساوم، هەمیشە(جێگرەوە)یەکم بۆ قوت کردۆتەوەو، جاری واش هەبو، دوان و، ئیتر ئەنجام سەرکەوتنە بەبێ گومان.

وەك وتمان پرۆگرامی هەولێر جیاوازتر بو، لێرە پەردەیەکی تازەی دیالۆج و کۆرسمان پێکهێنا بە تەمسیلەوە (جوانی بێ ناو) حەوت کچ هەر یەکی جۆرە بەرگێکی کوردی قەشەنگ بەنزیکەی دوسێ هەزار دینار ئاڵتونی ڕاستەقینەوە ئەیان سەندەوە وخۆشم قژکاڵی لێو ئاڵیم بۆ جاری یەکەم ئەوت لەسەر شانۆ، وە کاك(عبدالله سالار) بە قەشەنگترین شێوە دەوری کچی قژزەردی ئەدا ئەکردو (گۆرانی) ڕەحمەتیش لە خۆشی‌دا کە بە جارێ دوو دیالۆجی ئەو بەو ڕێك و پێکی‌یە بێتە سەر شانۆ، دەعوەتێکی گەورەی بۆکردین لە یانەی فەرمانبەران، ئەو حەلە لە ئەشغاڵی هەولێربو.

ئەم چالاکی‌یە هونەری‌یە هەولێری شڵەقاند، هێشتا دەعوەتی پارتی شیوعیمان تەواو نەکردبو، اخوان المسلمین بانگیان ئەکردین، لەوان ئەبو بوینەوە ئالی دوغرەمەچی، بە تایبەتی کاك دوکتۆر هاشمی برای بەڕێز و خۆشەویستمان کە بە درێژاییی تەمەنی و لە مەودای خۆیدا هەر خزمەت گوزاربوە، کە حەوت ڕۆژەمان تەواوکرد دوکتۆرە سانحەی کچی مێژوونوسی ئەمر ئەمین زەکی بەگ دەعوەتی بۆکردین بە ناوی باوکی‌یەوە بۆ شەقڵاوە، بۆ جاری یەکەم ئەو بوکە جوانەی کوردستانمان دی کە ئەو ناوەی لێ نراوە و دڵی مردو زیندوئەکاتەوە.

سەر لە بەیانی باسی هونەر و مێژووی کورد و کوردستان بو، جوانترین ڕاوێژ و بەتامترین قسەی بۆکردین لە هەموو بارەیەکەوە.

لە نیوەڕۆدا خوشکە سانحە سێ بەرخی بۆ کردبوین بە بریانی و وەرە لەو گەنجی‌یەداو لەو هەوا پاکەی شەقڵاواو لەو هەوای سەرکەوتن و وخوێن گەرمی یەداو مەچەك هەڵماڵەو هەتا ئەتوانی...

لە تافی عەسرا مۆسیقاوگۆرانی شەقڵاوەی خرۆشان و برامان حەمە صالح دیلان تیێ چریکان: وەفدی کوردستان! میللەت فرۆشان، هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان...

لەگەڵ سازو ئاوازا فرمێسك بە خوڕ سەری‌کرد لەو چاوانەی ئەمین زەکی ئەمرەوە هەتا حەمە صالح لێ بوەوە، ئینجا پێ‌ی و تین: خۆزگە ئە ئەمردم و چاوم پێتان ئەکەوت لەسەر شانۆ چیرۆکە مەلحەمی‌یە کوردییەکانتان ئەژیاندەوە و تەمسیلتان ئەکردن، خۆزگە قەلای دم دم ئەدی و ئەو قارەمانییەی هەتا دواکەس تەسلیم ئەبون بە تەمسیل یان سینەما.

لە دوای ئەمە وێنەیەکمان لەگەڵاگرت و ئەمجارە کاك عثمان مصطفی بۆی هێنام بۆ بڵاوکردنەوە، لەگەڵ وێنەیەکی کەی ئەو حەلەی هەولێر و سوپاس بۆ کاك عوسمان و وا هەر دووکیان بڵاوئەکەینەوە و ئەوانەی ناوم نەبردون ببورن چونکە ناویانم لە بیرچوەتەوە بابیرم بخەنەوە سوپاسیان ئەکەم و کێی تریش وێنەی ئەو حەلەی لایە با بۆمانی بنێرێ و پێشەکی سوپاس.

ئەو وێنەیەی سەرەوە لە ڕۆژی 22/ی ئەیلولی1946دا گیراوە لە شەقڵاوە

یەکەم: لەبەر نەخۆش کەوتن، دووەم: لەبەر یاخی بون، یان غەڕاییی گرتنی ئەوکەسە، یان کێشانەوەی لەلایەن کەس و کارییەوە، یان لەلایەن پارتێکی سیاسییەوە، یان لە بەرگرتنی، یا خوانە خواستە مردنی، ئەمانە هەموو ئەبێ لەبەر چاوبن، هەرگیز لە ژیانی هونەریمدا، لە سیاسەت و

لە دوای گەڕانەوەم بۆ سلێمانی کەوتینەوە گێژاوی دەرس وتنەوەو مەشق بە قوتابی کردن و هەموو پاش نیوەڕۆی دووشەموان و پێنجشەموانیش تیپی سرودی هەموو قوتابخانەکانی سلێمانیم لە(فەیسەڵی) کۆ ئەکردەوە و فێری سرودی نیشتمانی بەتین و ئێواران و شەویش پارتایەتی و

خوێندنەوەی کتێبی مارکسیزم و مناقەشەی گەرمی چەند سەعاتی بێ برانەوە و هەڵمان ئەگرت بۆ سبەینێ!

لە مانگی مارتی1947دا پارتی دیموکراتی کورد بۆ جاری یەکەم ئاهەنگی نەورۆزی بە ئاشکرا کرد لەم هۆڵی شەعبەی ئێستاکەی بەغداد، تەلگرافێکم بۆ هات کە بچم بۆ بەغداو چوم، لەوێ وتاری کوردی‌یەکە من و عەرەبی‌یەکە برایەك کە ناوی(صالح...) بو خوێندرایەوە و گوڵی خوێناویشم پێشکەش کرد.

ئەو شەوە ئاهەنگێکی پارتییانەمان لە ماڵی کاك بەکر ئیسماعیل بۆ کراو بۆ بەیانی بە ترس و لەرزەوە گەڕامەوە بۆ سلێمانی، چونکە وتارەکە زۆر توندوتیژبو، وابزانم کاك حمزەعبداللە نوسیبوی بە عەرەبی و لە دواییشدا کرا بە کوڕاس و لە سوریا چاپ کراو رەسمی منی پێوە چەسپکرا لە دوای ڕێنەی سەرەك بارزانی‌یەوە.

لە هاوینی ئەو ساڵەدا کۆستی گەورە لە کورد کەوتو کۆمار تێکدراو چوار ئەفسەرەکە خنکێنران‌و منیش بەناوی پارتی شیوعی‌یەوە، کە هەر دە دوانزە کەس بوین، خەڵقەکەم لەسەر قەبران هێنایە گریان‌و حکومەتیش منی بەهەشەشینا بردە خوارەوەو دەری کردم لە مامۆستایەتی، بێ نان‌و بێ ئاوو سەرگەردان‌و کۆشی خێزان، ئنجا دوای قستی سەری یەك بەدوای یەکدا بۆ کوشتنم، یەکەمیان کاك معروف العارف رزگاری کردم‌و دوەمیان خوا لێ خۆشبوی هاوڕێمان محمود احمدو چەند برادەرێکی تری شیوعی‌و، ئیتر کەمتر ئەهاتمە دەرێ‌و زۆر تر خەریکی رێکخستن‌و دەرهێنانی گۆڤاری (دەنگی جوتیاران) بوم، کە یەکەم گۆڤار بو بەکوردی‌و بەدەست نوس لە بارەی جوتیارانەوە دەریچێ، لەژێر تەوجیهی کاك ئەحمەد غەفورداو شانازی ئەکەم بەو دەنگی جوتیارانشەوە.

لەم ماوەیەدا پارتی کاك (عمر کریم)ی نارد کە شتومەکەکانی تەمسیلی تەسلیم بکەم‌و ئەمیشمان واو، ئیتر دوای ئەمەو هەتا ساڵی 1950 چیم بەسەرهات‌و ئەهات هەموی سیاسەتەو پەت پەتێن‌و مەینەتی‌و کوێرەوەری‌و هەمو سەعاتێکی بەرۆژێك‌و هەمو رۆژێکی بەساڵێك لە من رۆیشتوەو ئەگەر ماین ئەمیش لە شوێنی خۆیدا ئەگێڕمەوە، بەڵام تکام وایە لەو ماوەیەدا کێ چی ئەزانێت دەربارەی بزوتنەوەی هونەروەری بینوسێت، با ئەو ماوەیەش ئاشکرا بێت.

لە ساڵی 1950دا بەرەڵا کرام، بێ نان‌و بێ ئاوو بێ داڵدەو چومە خانەکەی میرزا فەرەجی رەحمەتی، لەوێ هەردوو برا جەمالی میرزا فەتاح‌و جەمالی میرزا عبداللە درێغی یان لێ نەکردم‌و هەتا هەڵسامەوە سەر پێ خزمەتیان کردم، لەم ماوەیەدا کاك ئەکرەم عیزەت کە قوتابی بو لە بەغدا ئیشی بۆ دۆزیمەوە لەڕێی خوا لێ خۆشبو رەشید نەجیبی مامیەوە لە ئێستگەی کوردی.

هەمو هەفتەیەك چیرۆکێکی تەمسیلی نیو سەعاتیم ئامادە ئەکرد، گۆڕاو یان دانراو ئەمدا بەئێستگە بەرامبەر بە (3)دینارو هەفتەیەك قبوڵ ئەکراو هەفتەیەك نە ئەکرا، بەوە ژورێکم گرت لە پیسترین ماڵی پیسترین گەڕەکی ئەم بەغدایەداو لەوێوە نەخشەی سەر لە نوێی ژیانم کێشایەوەو تێ هەڵچومەوە، لەو کاتەدا تیپێکی تەمسیلی لە ئێستگەی کوردی دامەزرا بو لەلایەن کاك صالح یحیێ زەنگەنەوەو ئەو چیرۆکانە بۆ ئەو تیپە بو.

لە پاش ماوەیەك بوم بەمذیع‌و ئنجا کەوتمە راست کردنەوەی باری ئێستگەی کوردی لە هەمو ناحیەیەکەوە وە بەهۆی برادەرانی باشەوە سەرکەوتین، ئنجا تیپێکی تەمسیلم دامەزراند کە بریتی بو لە برایان ئەحمەد محمد مەکینە (دلاوەر) کە پار بەداخەوە سەری نایەوە، ئەحمەد سید محمود (دەنگ گەورە)، نوری محمد عەنبەر، عەلی ئیبراهیم، فائق چالاك، ناو بەناویش عەلی مەردان‌و قادر دیلان.

لەم ساڵەی ئێستگەدا بیستم کە کاك شەماڵ صائب لە ئێستگە ئیشی کردوەو سودێکی باشی لە هونەرمەندان غانم حداد، جمیل بشیر، احمد الخلیل‌و ئەوانی تر وەرگرتوەو کاك شەماڵم دی‌و بەیەکەوە بەشەمەنەفەری دەرەجە (3) چوین بۆ کەرکوك‌و بەدرێژایی شەو ئاوازیان بە یاد کردەوەو گەلێك پرۆژە دانان، خۆلاسە داوای لێ ئەکەم کە ئەویش بجوڵێ‌و مێژوی ژیانی هونەری خۆی بنوسێ بۆ سودی بزوتنەوەی هونەروەری میللەتەکەی.

هەر لەم ساڵەدا کاك نوری عەنبەر داوای لێ کردم کە تەرتیباتێك بۆ کاك قادر دیلان بکەین‌و بیهێنیە ئێستگەو ناردی بەشوێنیاو دامەزرا لێرەو ئەویش سودێکی باشی لەبارەی هونەرەوە وەرگرت لەو برایانەی باسمان کردن، داوا لەمیش ئەکەم کە بجوڵێ‌و دەست بکا بە نوسین‌و باهەمو بەشدارانی رێ رەوی هونەر هەر کەسە لەلایەنی خۆیەوە دەست پێ بکات لەرێی کۆکردنەوەی کەرەسەیەکی راستی هونەروەری بۆ مێژویەکی راستی بزوتنەوەی هونەروەری‌و هونەرمەندان.

لەڕێی ئەم ئێستگەیەوە نزیکەی شەش ساڵ چیرۆکی تەمسیلی هەفتانەمان پێشکەش کرد، زیاتر لە (200) چیرۆکی نیو سەعاتی، کە زۆربەی زۆریشی تەسجیل کرا، ئەم تەمسیلانە کاریان ئەوەندە کاریگەر بو تەنیا بەشارەوە نەوەستا قەزاو لادێکانیشی راهێناو بزواندنی، چێژو تاوێکی ئەوتۆی هەبو کە بەهەزاران نامە لە هەمو گۆشەیەکی کوردستانەوە روی ئەکردە ئێستگە، هەندێ ماڵ گوێسوانەکانیان روخا، هەندێ ماڵ شتومەکی ناو ماڵی فرۆشتو رادیۆی کڕی.

هەرچی دەردێکی ناو ئەم کوردەواری‌یە هەیە، هەرچی ئاوات‌و ئازارێکی هەیە، هەموی کرا بەتەمسیل، بەمێژوی ژیانی گەورە پیاوەکانیشەوە، تەمسیلەکان هەمو گۆشەیەکی ژیانی کوردیان چارەسەر ئەکرد بەباری سیاسی‌و نیشتمانیشەوە.

گۆشەی پوختەی رۆژنامەکان‌و وتارو شیعرەکانیش وای لە جەماوەری کورد کرد کە میلی رادیۆ لەسەر ئێستگەی کوردی لانەدەن بۆ هیچ شوێنێکی تر.

هەر بۆ جاری یەکەم لە مێژوی نەتەوەی کوردو ئەم ئێستگەیەشدا (ئۆپەرێتی دڵداری کوڕە شوان)ی کاك محمد احمد طه (کامەران)م تەلحین کردو بۆ ماوەی 35 دەقیقەو بەگەورەترین تیپی مۆسیقای (هەوایی)و (وەتەری) لە ئێستگەوە بەئاواز ئەو چیرۆکە بڵاوکرایەوەو هەشت دەنگ بەگۆرانی ئەدای ئەکردو گەورەترین سەرکەوتنی وەرگرت،

هەر لەم ئێستگەیەدا برایان علی مەردان‌و تاهیر تۆفیق‌و حەسەن جەزراوی‌و ئیبراهیم حەزین‌و احمد سید محمودو سیوەو بێ ناوو رەسوڵ گەردی‌و ئنجا ئەڵماس خان‌و فوزیە محمدو نەسرین شیروان‌و گوڵ بەهارو گۆرانی بێژەکانی کەم ناسیوە لە تواناو دەنگیان گەیشتم.

لێرەدا پێویستە بۆ مێژو بڵێم کەلەناو کوردا هەتا ئێستا کەس هەڵنەکەوتوە بەقەد مامۆستا عەلی مەردان شارەزای مەقامات بێ‌و زۆربەی زۆری مەقام بێژە عەرەبەکانی ئەم عێراقەش لەم بارەیەوە قوتابی ئەون، خۆم لێم دیوە کە محمد

گوبانچی پرسی پێ کردوەو ناظم غەزال خوا لێ خۆشبو لێی پاڕاوەتەوە شتی فێرکات بە تایبەتی (قفل)، بەڵام ئەمیش بەختی نایکات و کوڕەو ئەبێ بمرێ و کەس تەقدیری نەکاو ئانێکی رەحەتی نەبێ.

داوا لە هەمو ئەو هونەرمەندانە ئەکەم، کە هەر کەسە مێژوی ژیانی هونەروەری خۆی بنوسێ و بەرەسمەوە بۆمی بنێرێ.

براینە! پێ راتەکێنن و بنوسن و بەرهەمەکانتان تۆمار بکەن و یەکتریتان خۆش بوێ و رێزی یەکتری بگرن و بەیەکا بجۆشێن، ئەی هونەرمەندانی کوردستان.. کۆمەڵی هونەرە جوانەکانی کوردستان پێك بهێنن.

هەر لەماوەی 1950 هەتا 1956، چەند گۆرانیەکی کۆنی کوردیم تێ هەڵکێش کرد و یەکێکیان (خاڵەی رێبوار) بو کە کارێکی زۆری کردەسەر خەڵقی و سەرلەنوێ ئەو گۆرانیانە بەناو خەڵکا دەماو دەم کەوتەوە، وەبا ئەوەتان پێ بڵێم کە ئەو ئاوازەی من ئەو خاڵەیەی پێ ئەڵێم لەدەمی خوالێ خۆشبو (شێخ قادری حەفید)م قۆستوەتەوە و کە دویەمو گۆرانی ئەوت مئی ئەمێنایە گریان و ئەوپیاوەش لەدەرونا هونەرمەند بو، جەرگ بریندار و بەئاوات نەگەیشتو.. کاکە شێخ! سڵاو لەیادی تۆش لەرێزی هونەردا، خەڵکینە پەیکەرێکیش بۆ هونەرمەندی ناو کاروانی شەهیدانی هونەر کاك (ئەحمەد دلاوەر) لە شاری هەڵەبجەو بۆ بەشی هەشتەم وەکو بیستومە لەو ماوەیەدا کە من لە عەمارەو بەغداد کاك رۆوف یحیی چیرۆکی (کەرە لوتی مەنوچەری)ی کاك برایم ئەحمەدی وەرچەرخاند بوە سەر باری شانۆیی لە ساڵی 1948دا، وە ناوی نرابو (تێکۆشانی رەنجبەران) وە لە سانەوی سەرەوە پێشکەش کرا بو، ئەو برایانە کە بەشدار بون: کاك رۆوف خۆی و، خوا لێ خۆشبو حسن تۆفیق، کاك دارا تۆفیق، کاك عبداللە سالارو هەندێ برای تر.

وە لە ساڵی 1950– 1951دا برایان کاك رۆبێست ئۆفیل و ئەمین شەوکەوت و قادر دیلان و نەجات عەبدەو هەندێکی تر، شانۆیی (هاملت)ی شکسپیریان لە سینەمای رەشید پێشکەش کرد بو.

وە لە ساڵی 1952– 1953دا (کڵۆڵانی هۆگێ) لەلایەن کاك محمد احمد طەو چەند برادەرێکی کەوە پێشکەش کراو هەر لە سلێمانی، لە بەغداش کاك محمود محمد قادر گۆرانی گوڵی خوێناوی وە جوانی بێ ناوی تۆمار کردبو لە ئیستگە، هیوام وایە بەشدارانی ئەو چیرۆکانەی باسمان کردن هەریەکەیان دەوری خۆی ساغ کاتەوەو زانیاری راست و تەواومان بۆ بنێرێ.

هەر لە ماوەی 1950– 1956داو نازانم چ ساڵێکە، رۆژێکیان، خوا لێ خۆشبو ئەحمەد دلاوەر پێی وتم کە گۆرانی بێژێکی باش هەیەو وا لە ئوتێل شیمال لە مەیدان.

هەڵساین چوین کە تەماشا ئەکەم کوڕێك زەبون و لاواز، دیشداشەیەکی لەبەردایەو خەریکی سڕینی هۆڵی ئوتێلەکەیەوئارەقی شین و مۆری کردۆتەوە، پاش دواندن و گۆرانی وتن، بردمان ئەرزو حاڵمان پێداو لە ئیستگە کردمان بەگۆرانی بێژ، ئەمیش ئەوکەسەیە کە لە دواییدا بەسەدان بەرهەمی گۆرانی لە عێراق و ئێراندا هێنایە ناو ئاوان و حەسەن زیرەك بو، وەلەم دواییەدا وەك بیستمان بەداخەوە چوە جێی هەقی خۆی ئەمیش شەهیدێکی کەی رێی هونەرەو سڵاو لە یادی.

ئەم کاك حەسەن زیرەکە، یەکێکی کەشی لەگەڵ خۆیدا پەیدا کرد کە ناوی کاك ئەحمەدی شێخ قاڵی بو، هەندێ جار بەجوتە گۆرانییان ئەوت و هەندێ جاری کەش، کاك ئەحمەد بۆی ئەسەندەوە.

بێگومان ماوەی1950–1956 لە ئێستگەو لە بەغداش قوتابخانەیەکی تربو بۆمن لە بارەی هونەرەوە، لەم ماوەیەدا بە سەدان چیرۆك و کتێبم خوێندەوە، تێکەڵاوی هەموو هونەرمەندەکانی تەمسیل و مۆسیقاو گۆرانی و ئیخراج بوم، لە مۆسیقادا کاك جەمیل بەشیر و غانم حداد و ئەحمەد خەلیل و ناظم نەعیم و منیر بەشیر و هەندێکی تریانم بە دڵ بوو، لە تەمسیل و ئیخراجیشدا هیچ کەسێك، سەوریەی برا عەرەبەکانمان نزمتر بو لە سەوریەی ئێمە لە هەموو بارێکەوە، لێرەدا بە پێویستی ئەزانم ئەوە بڵێم کە مامۆستا حقی الشبلی بۆ ماوەیەکی کەم هێنرایە بەشی عەرەبی وە تەنیا ئەوم بە دڵبو لەم ناحیەیەوە، وەك مامۆستایەکی شارەزای هونەر، لەم ماوەیەدا فێری چۆنێتی بەکارهێنانی(مۆسیقای تصویری) ومۆئەراتی صوتی بوم، گوێم لە ئاوازە رۆژئاواییەکان ئەگرت و ئیشارەتم ئەدان بۆ ئەو شوێنانەی ئەبێ لە ناو چیرۆکەکەدا بە کاربهێنرێن، هەروەها(دەنگە کارتێ کەرەکان)، چیرۆکی باش، دۆزینەوەی نوێنەری باش بۆ دەورەکان، بەکارهێنانی رێی چۆنێتی نزیکبونەوە دورکەوتنەوە لە میکرۆفۆن، باش بە کارهێنانی قورگ و دەم، بۆ دەربڕینی قسەکان، تەرکیز لەسەر چیرۆکەکەو بیرنەڕۆیشتن بە هیچ لایەکدا، باش گەیشتن لە چیرۆکەکە خۆی و ناوەڕۆکەکەی، لەگەڵ باش بە کارهێنانی ئاوازی گونجاوی مۆسیقاو کارتێکەرەکان، ئا ئەمانە هەمویان ئەبنە هۆی سەرکەوتنی چیرۆکی تەمسیلی ئیستگە کە جیاوازی هەیە لەگەڵ چیرۆکی سەر شانۆ یان ناو تەلەفیزیۆن.

زوربەی زۆری چیرۆکە هەفتەییەکانم بە شەو لە ماڵەوە یان بەرۆژ لە چاخانەکەی کاك علی لە مەیدان ئامادە ئەکرد، لە ناو قەڵەباڵغی و دۆمینەو تاوڵەی ئەملاو ئەولاما، نزیکەی(30) لاپەڕەی دەفتەری قوتابییان(حوار) بەسە بۆ چیرۆکێکی‌نیو سەعاتی ئیستگە، کە لێ ئەبومەوە، بۆ هەندێ برادەرانی رووناك بیرم ئەخوێندەوە و ئینجا دەورەکانم دابەش

ئەکرد بەسەر برا نوێنەرەکاندا پاش ئەوەی بۆ ئەوانیشم ئەخوێندەوە ریەکالام ئەکردەوە.

چیرۆکەکانم بەپێی نوێنەرەکان و توانایان دائەڕشت، دەوری هەرە دور و درێژ بۆ خۆم، دەوری حاجی و پیاوی پیر بۆ کاك نوری عەنبەر، دەوری پیرێژن بۆ خوالێ خۆشبو ئەحمەد دلاوەر، دەوری کچیش یا منالێ بۆ کاك احمد سید محمود چونکە ئەبەراتی دەنگی زۆر نازك و خۆش بو، دەوری تریش بۆ فائق توفیق یا برادەرەکانی کە.

لەم ماوەیەدا، لە قولاییی رەوشت و هەڵسوکەوتی ئەوانە گەیشتم کە لە کۆڕومەیدانی هونەردا ئیش ئەکەن، بیرکردنەوەیان، ئاوات و ئازار و ئامانجیان، رەفتاریان لەگەڵ یەکدا، شەرنخونی‌یان و زۆرشتی کەش کە پێویست بە باس کردنیان ناکات و، ئەبێ هەمو کەسێك ئەوە بزانێت کە هونەرمەندیش فریشتەی ئاسمان نی‌یەو هەر تەنیا ئەوەنی‌یە کە تۆ لەسەر شانۆ ئەیبینی، یان گوێت لە دەنگ و ئاوازی ئەبێ، یان چاوت بە نیگارە جوانەکانی ئەکەوێ لە پێشانگایەکدا، ئەوی ئەمەوێ بیڵێم: هونەرمەند جیاوازترە لە ناهونەرمەند لە زۆر شتاو جارێکی کەش ئەیڵێمەوە بەرزی رەوشت مەرجی دوای بەهرەیە بۆ هەموو هونەرمەندێك کە بیەوێ ئەدۆڕێ.

با ئـەوەش لـە یـاد نـەچێ کـە توانیمـان مـاوەی بڵاوکردنـەوەی پرۆگرامەکانی بەشی کوردی زیاد بکەین و بەیانیانی هەینیشمان خستە سەرو بۆ جاری یەکەم لە مێژووی ئەم بەشی کوردییەدا هەموو مانگێك پرۆگرام و هەندێ وتارمان بە کوردی لە گۆڤاری ئیستگەدا بڵاوئەکردەوە و لەو رۆژەدا ئەمە کارێکی کەم نەبو.

هەر لـەم ماوەیـەدا شـەوی وا هـەبو ئـەچوم بـۆ دو فیلـم نـەك یـەکێك، بەتایبەتی فیلمی بێگانە، بۆ حەسانەوەش و کەڵك وەرگرتنیش.

لە ئاغستۆسی 1956دا گوێزرامەوە بۆ کێڵگەی بەکرەجۆ لە سولەیمانی و شارگرمان کردەوە، لەگەڵ هاتنەوەمدا برا قوتابییەکانی سانەوی شەو وە بەتایبەتی برای خوشەویست و بەوەفام کاك نوری وەشتی داوای لێ کردم کە بەشداری شانۆگەری بکـەم لـە ڕێی بـاربۆی ئـەو قوتابییـە دەسـت کورتانەدا کە بەشەو ئەخوێنن.

کاك (سلیمان الملاح) کە بەڕێوەبەری سانەی بو پشت گیری کردین و ئەویش یادی بەخێربێ، لەم ساڵەدا چیرۆکی شانۆیی (عطیل)ی شکسپیر لەلایەن کاك نوری وەشتی و طە خلیل و یاسین خلیل و خواڵێ خۆشبو صلاح جمیل و هەندێك برادەری ترەوە تەمسیل کراو چوم بۆ پراوە و بۆ تەمسیلەکەشی، لێرەوە ئەو برادەرانەم ناسیو کە تەماشا ئەکەم کاك ئەنوەر توفی براشمان کە لەسـاڵی 1947دا بـە مامۆستایی ناسیبوم وا ئـەویش خەریکی ئیخراجە و لەبەکرەجۆوە گوێزراوەتەوە بۆ سولەیمانی.

هەر لەو ساڵەدا بو برای بەڕێز و بەتوانا (عبدالله بەگی حەمە عەلی بەگ) لەسوپاوە هاتە ریزی ئیدارە و بو بە یارمـەتی دەری متصرفی سولەیمانی بۆ کاروباری بەڕێوەبەرایـەتی ناوخۆیی و ناردی بە شوێنما و رێگـەی بـۆ ئاسان کردین و لیژنەیەکی بەرزی دامـەزراند بۆ کاروباری هونـەروەری و دەسمان کرد بە ئیش کردن و بەهاتنی عبدالله بەگ گەورەترین چالاکی و بزوتنەوەی هونەروەری لە سولەیمانیدا دەستی پێ کرد.*

1992/12/9

## پەراوێز:

ئەم بابەتە لە دەستنووسێکی خودیی هونەرمەندەوە وەرگیراوە.



پیسکەی تەڕپیر، سالی 1962 1.ڕەفیق چالاك، 2.عەبدوڵا عەباس، 3.نوری وەشتی، 4.تەها خەلیل



شانۆگەری گڵکۆی تازەی لەیل 1956 . (ڕەفیق چالاك، ئەنوەر لە حمەد سەیفوڵا

# شانۆنامەی دکتۆری دێم

ئامادەکردنی: رەفیق چالاك

فکرەکە و هەندێ حیواری لە شانۆنامەی

(بەزۆرکردیان بە دکتۆر)ی مۆلیێر وەرگیراوە

**تێبینی:**

بۆ ئەوەی لە هەمو شوێنێکی کوردستاناو بە کەمترین ئەرك و توانا تەمسیل بکرێ و خەڵکی چێژی لێ وەربگرن تەنیا فکرە و هەندێ حەوارم خواستوە لە ئەسڵەکەو بەس.

## پەردەی یەکەم

دیکۆر: ژورێك یان هەیوانێکی لادێ

پێویستی:

1- دودەست جل وبەرگی لادێ بۆپیاو

2- دەستێك جلی کوردی بۆ ژن

3- کۆڵێك داری سوتەمەنی و دۆشەك و لێفەوسەرین

4- دوو دار بۆ لێدان و هەندێ شتومەکی ناوماڵ(صندوقی بوراق)

5- تەورو تەورداست و گوریس

ساله: زۆر وتنی ناوێ، گەورەی ماڵ منم نەك تۆ، ئیش ناکەم و تاقەتم نیە و برایەوە.

خازە: منیش پێت ئەڵێم کە دنیای ئەمڕۆ دنیای دوێنێ نییە، ئافرەتیش هەقی قسەی هەیە.

ساله: ماڵی ئەوەم وێرانکرد کەژن هێنانی داهێنا، ئەگبەتیە پیاو ژن بهێنێ، ئەرەستو راستی کرد کەوتی ژن لە پەراسوی شەیتان دروست کراوە.

خازە: ئەرەستو بیزانیایە تۆ ناوی ئەهێنی قەت قسەی نەئەکرد.

ساله: رۆژەکەی ناخۆشە و مەزاجم پرتەقاڵییە و تاقەتم چو ئەوەندەم داربڕی و ئەوەندەم دار دا بە کۆڵما.

خازە: هەر کەسە لە ژیانا ئەبێ ئیشێك بکاو بەو ئیشە بژی.

ساله: من حەز لەم ئیشە ناکەم، من پیاوێکی خوێندەوارم، کتێبم خوێندوتەوە، لە دنیا گەیشتوم، هەتا ئێستا هەزار جۆرە ئیشم کرد، شەش ساڵیش هەر لە خزمەت دوکتۆرێکی گەورەدا بەردەستیم کردوە.

خازە: ماشا الله لە فەیلەسوف، ئینجا چیە، ئەوە ئاخرییەکەت نییە، کورتە شڕوپڕ، بێ نانو بێ ئاو وماڵ وێران.

ساله: قەیناکا! ئیمە ئەمبێ، خوێندەوارم، نوسەرم، هونەرمەندم، سیاسیم.

خازە: "قاقا پێئەکەنێ"، چیت چیت؟ تۆی عەمرەکەم، ئەڵێی داری واوەیلایت. نوسەر و هونەرمەند وسیاسی؟ ئەوەلای یەکێ بڵێ ئەت ناسێ،

ساله: ئەوە گاڵتەم پێئەکەی خازە لا بە لا؟

خازە: ئەء حورمەتت ئەگرم نوسەرو هونەرمەند و سیاسی دارفرۆش.

ساله: یەعنی چی؟

خازە: بەوخوایەی دروستی کردوین شتێکم بەدەست بوایە ئەمکردی بە بەربەر؟

ساله: ئەی بەڵام لێدای بۆچ ژنێکی ئاوا.

خازە:لەعنەت لەو رۆژەی چارەم لە چارەت نوسرا ئاوا.

ساله: سەد هەزارجار، بەخواشەق بەری ئاچم بۆ دارستان.

خازە: ئینجا ئاچی چش، خۆ شوکر هیچی تر نەماوە بیفرۆشی. ماڵت وێران کردم هەرچی یەکم هەبو بردت.

ساله: بێ ئەقڵ مەبە، رەحمەتی چی تری بەجێ هێشتوە دەری بێنە باخومانی پێ بژێنین، دنیا ئەوەندە ئامێنێ.

خازە: ئاخر خەتای خۆم بو کە لە دوای مردنی رەحمەتی لەسەرماڵی خۆم دانەنیشتم و شوم کرد بەتۆ.

ساله: باوو باپیرمان وتویانە میراتی کەر بۆ کەمتیارە...(شو) خۆشە، بۆ کچیش و بۆ بێوەژنیش.

خازە: خوا ئەم شوە ببڕێ کە من کردم وتوشم بو بە توشی تۆوە.

ساله: بۆ من چیمە ئافرەت؟ پیاو نیم؟

خازە: تۆ؟ بەڵێ نوسەر و هونەرمەند وسیاسیت، ئاقڵی، بەڵام نەنوسینت نوسینەو، نە ئەزانی هونەر چیەو، نەسیاسیشیت عەمرەکەم نەمێنێ بۆعەقڵەکەشت.

ساله: کەواتە بە هیچی من رازی نیت؟

خازە: حاشا، بەچیت ڕازی بم؟ خۆمنیش خەڵکی نیم پێت بخەڵەتێم، هەی لە رێوی قوماربازتر، هەی سەرخۆشی بێ هۆش.

ساله: مەسەلەکە گەیشتە ئەم رادەیە خازە رەشەبا.

خازە: ئەرێ وەاللە ساله لەرزانە.

ساله: بەشەرتی خوا دەردت دەرمان بکەم بەسەرتەوە نەچێ.

خازە: بەو خوایەی تۆی سوێندی پێ ئەخۆی دەستم بۆ بێنی توشی چورتمێکت ئەکەم.

ساله:(دەست ئەداتە دارێك و یەك دوو داری تێ ئەسرەوێنێ) ئەت کوژم واللە.

خازە: (هاوار ئەکات) ئای کوژرام، کوشتمی، ئەی هاوار، خوایە هەڵی ئەگری.

رەسوڵ: (دێتەژورە وە بە هەڵەداوان) ئەوەچییە؟ کێ لەژنەکەی ئەدا؟ ئەوە عەیب نییە؟

خازە: ئینجا تۆ هەقت چییە کابرا؟ مێردی خۆمە ولێم ئەدا.

رەسوڵ: کەیفی خۆتانە.

خازە: من خۆم پێم خۆشە.

ڕەسوڵ: ئەم ئەزانی لێدان خۆشە.

خازە: کێ تۆی بەکرێ گرتوە کابرا؟

ڕەسوڵ: کەس خۆ کفرم نەکرد؟

خازە: من لەشم فێرە هەتا ئێستا سێ شوم کردوە بێ ئەقڵ.

ڕەسوڵ: (بەچەپۆك ئەکێشێ بەسەری خۆیا) ئەی قوڕبەسەر من.

خازە: قوڕبەسەر باوکیشت.

ڕەسوڵ: لاحەولەوە لا....

خازە: چەنە بازی، دریژەی مەدەرێ وبێ دەنگبە(زللەیەکی لێ ئەدات)

ڕەسوڵ:(دەست ئەگرێ بەرومەتیەوە وروئەکاتە سالە) برام لێم ببورە و ئارەزووی خۆتە. چۆنی لێ ئەدەی لێدە، بەغیرەتم بیکەی بەتریت قسەناکەم.

سالە: بەخوا کابرایەکی بێ دەماغی.

ڕەسوڵ: بۆچی براکەم؟

سالە: چونکە قابیلە لەسەر رای جەنابت معامەلە لەگەڵ ژنەکەما بکەم؟ ژنی منە یا ژنی تۆ.

ڕەسوڵ: ژنی خۆتە براکەم.

سالە: من پێویستم بەرای جەنابت نیە.

ڕەسوڵ: باشە براکەم

سالە: شیشرۆن ئەڵێ....

ڕەسوڵ: باشە براکەم.

سالە: ئەم براکەم براکەمەت لە چیە گەوجە؟ (زللەیەکی لێ ئەدا)

ڕەسوڵ: (بەدەم ڕۆیشتنەوە) سەد الحمد للە کە ئەژنی کابرایەکی واگەوج و ئەمێردی ئافرەتێکی وابێ حەیابوم...

سالە: ئەوە ئەڵێی چی کابرا؟

ڕەسوڵ: هیچ نالێم ئەڵێم ئێوە خێزانێکی بە ختیارن براکەم.(ئەچێتەدەرەوە)

سالە: (ڕوئەکاتە خازە) وەرە ئاشت بینەوە.

خازە: ئاشت نابمەوە.

سالە: بێ ئەقڵ مەبە، لە بەینی ژن ومێردا ئەم شتەوردانە هەر ئەبێ.... لێم ببورە و ئەمە.

خازە: بەڵام هەرتۆڵەت لێ ئەستێنم، ئافرەت زۆرشتی لەدەست دێت.

سالە: منەتت نەبێ، وەرە دنیا ئەوە ناهێنێ، وانە شچم بۆ دارهێنان، شەرت بێ دەکۆڵت بۆبێنم.

خازە: (لێی نزیك ئەبێتەوە وەدەست ئەخەنە دەستی یەك) منیش هەتا یەیتەوە شتێکت بۆ دروست ئەکەم.

سالە: (دەست ئەداتە گوریس و تەورداس و ئەکەوێتەڕێ)...

پەردەدانەدرێتەوە

## پەردەی دووەم

دیکۆری دارستان

. دوودەست جلی کوردی بۆ خزمەتکار

نەریمان: یاخوا کەس وەکو ئێمە توش نەبێ.

مالە: بۆ توش بوین؟ ئیشە و ئەیکەین. ئەی چۆن بژین؟

نەریمان: ئینجا ئەمەش پێی ئەوترێ ژیان؟

مالە: بەخوا من قانعم.

نەریمان: خزمەتکاری، ریا، درۆکردن، رۆژی هەزار پولاتیقە و ساختە چێتی.

مالە: بەخوا من بەش بە حاڵی خۆم قانعم.

نەریمان: تبعەن قانعی مالە، هەتیوچەیەکی پیسەکەی بێ وەفای بێ ئەمەك، لە ئیسك بێ بەروپشت تر، لە هەڵمات بێ‌بارتر، کەوتوی بە ناز و نیعمە تا لای ئاغا...

مالە: رجات لێ ئاکەم نەریمان عەیبە ئەم قسانە ئەگینا زۆر متاثر دەبم...

نەریمان: کورە متاثر نابێ چش، ئینجا تۆکەی حست هەبوە و شعورت کردوە.

مالە: لەسەری برۆی دەگەڕێمەوە و بە ئاغا دەڵێم سەد شەقت تێ هەڵدات... ئێمە بۆچی هاتوین و تۆباسی چی دەکەی سەلامەت بی.

نەریمان: کورە سەلامەت نەبی. ئاخر کچە حەز لە کابرایەکی تر ئەکاو باوکی ئەیەوێ بیدا بە یەکێکی ترو ئەمیش خۆی(لاڵ) کردوە و تەواو، ئیتر نەخۆشی چیو؟ دوکتۆری چی؟

مالە: قەیدی نییە، ئێمە دوکتۆرێك حەکیمێك هەر دەدۆزینەوە و دەیبەین و فەرمانی ئاغا جێ بەجێ ئەکەین سەلامەت بی.

نەریمان: باشە تۆ بۆ بەدرۆ بە ئاغا ئەڵێی کە دکتۆری باش هەیە؟

مالە: کورە واباشە عەقڵت بێ، پیاو ریاکارو درۆزن نەبێو پولاتیقە ئەکات بۆ خەڵکی ئاژی.

نەریمان: ئەحلەت لەو ژیانەی تەراوزی تیا نەبێ، ئەحلەت لە وژیانەی کاروباری بەدەست ئاغا و بەگی ئەزان و گەوج و دزەرە بێ.

مالە: قولاغ وێرمە جانم، قولاغ وێرمە.

نەریمان: ئەم وێرمەیە چیە مالە؟

مالە: یەعنی گوێ مەدەرێ....

نەریمان: ئا با لەو ئافرەتە بپرسین....

خازە: (لەو سەرەوە دێتەژورەوە)

مالە: خانمەکە سلامون علێکم

خازە: ئۆ رەزات خواتەرە.

نەریمان: خوشکم تورە مەبە پرسیارێکمان هەیە.

خازە: وایلێ، ئێوە کێن.

مالە: ئێمە خزمەتکاری میناغاین.

خازە: تۆدەمت لێك نێ، چیتان ئەوێ.

مالە: بۆ دەمم لێك نێم؟

خازە: چونکە سەرو قەپۆزتم بەدڵ نیە.

نەریمان: دەبێ دەنگ بە مالە، خوشکم کچی ئاغامان نەخۆشە.

خازە: ئەوە حەز لە شو ئەکات.

نەریمان: نەخۆشیەکەی ئەوەیە قسە ناکات ولاڵ بووە... پێویستمان بە دوکتۆرێکە.

خازە: ئێ ئێ، ئینجا دوکتۆرتان دۆزیوەتەوە؟

نەریمان: نەخێر.

خازە: من دووکتۆرێکی باش ئەناسم.

نەریمان و مالە:(بەیەکەوە) دەی بە قوربانت بم.

خازە: ئەوە تا لەو دارستانە دار ئەبڕێ.

مالە: چۆن دوکتۆر دار ئەبڕێ؟

خازە: ئارەزووی خۆیەتی، زەوقی لە داربڕینە.

نەریمان: بەڵێ فەرمو.



خازە: کەپێتان وت تۆ دوکتۆری و وەرە لە گەڵمانا گاڵتەتان پێ ئەکاو ئەڵێ من دوکتۆرنیم و هەزار سوێندیشی لەسەرئەخوا.

نەریمان: راستە هەندێ لە پیاوە گەورەکان شزووزیان هەیە. بەڵێ..

خازە: ئەگەر ئەمات لەگەڵتانا دەستی لێ بدەنە دارو تۆزێکی لێ بدەن.

نەریمان: ئێێ

خازە: ئیتر دێت لەگەڵتانا، ئەو مینەئاغایە لەچ دێیەکە؟

مالە: لە دێی قوڵتاش.

خازە: ئێ‌ئێ، ئەیزانم...

نەریمان: باشە هەتا ئێستا کەسی چاك کردۆتەوە؟

خازە: ئەی گوایە چۆن، سێ هەفتە لەمەوبەر کابرایەك لە سەربان کەوتبوە خوارەوە بەسەر سەراو سەری چوبوبە ملیا و ملی بەلەشیا.

مالە: ئێی؟

خازە: بەسەری باوکت کاکە مالە. سەری لە لە شی دەرهێنایەوە و ئێستاکابرا حەیران ئەڵێ.

نەریمان: برایەوە، دەی خێرا بابڕۆین.

خازە: (بە اتجاهی معاکس ئەڕواوئەڵێ) ئەڵێن کێ پێی وتون ها، ناویشی سالەیە... دوکتۆر سالە مێردی خازە.

نەریمان: نەء نەء خوا حافیز، باشە (لەپاش چەند هەنگاوێك ئەگەنە نهایەتی شانۆ) (چراکوژاندنەوە و داگیرساندنەوە).

نەریمان: مەرحەبا.

سالە: مەرحەبا قوربان.

مالە: مەرحەبا دوکتۆر.

سالە: قسەی قۆڕمەکەن. وتتان مەرحەباوتمان باشە و برایەوە (کوڵەکە دائەنێ لە ناوەراستی شانۆدا). شوشەکەی دەرئەهێنێ و دائەنیشێ وپاڵ ئەدات بەدارەکەوە و ئەخواتەوە).

نەریمان: خۆیەتی، بەکرداریاو بەم تورەییەدا خۆیەتی.

مالە: جەنابت کاك سالەی؟

سالە: ئا منم، ئەمرێك خزمەتێك؟

نەریمان: گەورەم ناوبانگی ئێوەمان بیستوە و ئەزانین کە تاج رادەیەك بلیمەت و زانای.

سالە: (پێ ئەکەنێ) لەچی‌یا؟ لەداربڕینا؟

مالە: نەء قوربان

سالە: لەدەلاکی‌یا؟

نەریمان: نەء قوربان نەء

سالە: ئەی لە نازایەتیدا؟

مالە: نەء قوربان، لە عیلما، لە زانستا، لە فولفوسا.

سالە: (ئەداتە قاقای پێکەنین) ئەی بێ غیرەت، فولفوس چی‌یە گەوجە؟ بڵێ فەلسەفە.

نەریمان: یاخوا ماڵت ویران بێ مالە، بەڵێ قوربان لە حیکمەتا، لە دوکتۆریدا.

سالە: ئێوە غەڵەتن، بەسەری باوکتان من هیچ نازانم لە داربڕین زیاتر.

نەریمان: ئینجا بە تەواوی دەرکەوت کە خۆیەتی.

سالە: وەرن پیاوی چاك بن ئەم دارەم لێ بکرن با بە خۆشی بڕۆمەوە ماڵەوە.

نەریمان: ماڵی چی قوربان؟ کچی ئاغامان زمانی بەستراوە و جەنابیشت باشترین دوکتۆری و ئەتبەین بۆ ئەوێ.

سالە: من پیاوی رابواردن نیم بڕۆن بەڕێی خۆتانەوە.

مالە: دییێت یان دەستپێبکەین؟

سالە: دەست بەچی؟

نەریمان: بەلێدانت.

ساڵە: ئێوە زۆر سەیرن. من ئەڵێم فەرم بەسەر مامانیشەوە نییە چچارێ دوکتۆری.

ماڵە و نەریمان: (دەست ئەکەن بەلێدانی) دوکتۆری یان نا؟ بڵێ، بڵێ.

ساڵە: (بەنازارەوە) بەڵێ دوکتۆرم.

نەریمان: دەبیورە لە دەستدرێژیمان گەورم.

ساڵە: کارتان ڕاست نەبێ و وازم لێ بێنن.

ماڵە: هەڵسە بابڕۆین درەنگە هەڵسە پێشمانکەوە.

ساڵە: ئەی کۆڵەدارەکەم؟

نەریمان: یەک بەدە پارەت ئەدەینێ هەڵسە.

ساڵە: مەسەلە پارەشی تیایە؟

ماڵە: بەڵێ پارە؟ جلوبەرگی چاک. نوێنی پاک و تەمیز. فرج، قەلەمون. گیسک. بڕۆ با بە بۆنەی تۆوە ئێمەش تێر بخۆین گەورەم.

ساڵە: (هەڵئەسێتە سەرپێیان) دنیایەکی سەیروسەمەرەیە، عەجایەب شێوێنراوە بە ئەنقەست.

## پەردەی سێیەم

دیکۆر– ژوورێکی جوان لە کۆشکی ئاغا.

پێویستی– قەرەوێڵە– چەند کورسیەک، مێز و شتومەکی ناوماڵ.

نەریمان: گەورەم، دوکتۆرێکی باشمان دۆزییەوە.

ماڵە: باشترین دوکتۆر لە عالەما.... مرد و چاک ئەکاتەوە...

نەریمان: بەڵام هەندێ جار خۆی لە بیرئەچێتەوە و بەجۆرێکی تر خۆی نیشان ئەدات.

ماڵە: حەز لە گاڵتە و گەپیش ئەکات...

نەریمان: زۆر مەشهورە لەو ناوچەیەو خەڵکی هەمو باسی زانین و عالمی ئەکەن.

ماڵە: کە قسە ئەکات ئەڵێی کتێب ئەخوێنێتەوە...

میناغا: بەسەری باوکم پێم خۆشە، بانگی کەن.

نەریمان: هەر ئێستا ئەیهێنمە ژوورەوە.... (ئەچێتەدەرەوە)

ماڵە: قوربان من خۆم بە تەنیا ئەم دوکتۆرەم دۆزیوەتەوە....

میناغا: باشە ئافەرم.

ماڵە: قوربان حەز لە گۆشتیش ئەکات.

میناغا: ئەی حەز لە نانو ماست ناکات.

ماڵە: نەخێر قوربان.

میناغا: ئەی ساوەر ماڵە؟

ماڵە: نەخێر، برنج وگۆشت.

میناغا: بەخوا دوکتۆرێکی سەیرە.

ماڵە: یەک تکاشت لێ ئەکەم قوربان.

میناغا: چییە ماڵە؟

ماڵە: هەرچی یەک بڵێ و هەرچییەک بکات لێی عاجز مەبە. چونکە زۆر عالمە.

میناغا: بەڵێ، بەڵێ، ئەزانم منیش فێری ئسوڵ بوم.

نەریمان: (دێتە ژوورەوە و ئەڵێ) فەرمو جەنابی دوکتۆر، فەرمو.

ساڵە: (دێتە ژوورەوە) مەرحەبا ئاغا.

میناغا: وەی علیکم السلام ورحمة الله، (دەستی بۆ درێژ ئەکات بۆ تەوقەکردن)

ساڵە: پێویست ناکات، مۆدەی نەماوە.

میناغا: بۆچی جەنابی دوکتۆر؟

ساڵە: چونکە هەندێ دەست ملەوەسن.

میناغا: ملەوەس چی‌یە قوربان.

ساڵە: یەعنی پیس، ناپاک.

میناغا: واللە جەنابی دوکتۆر بە ئاو و سابوون شتومە.

ساڵە: فایەی نییە. هەردەستێک درێژ بو بۆ سەروماڵی خەڵکی، بۆ سەر گیانی خەڵکی هەرگیز پاک نابێتەوە ئەگەر بە هەمو ئاوی دنیا بشۆرێتەوە.

میناغا: ئینجا ئەوە مەبەستت چییە لەوە؟

ساڵە: درێژەی مەدرێ. قابیلە هاتیم جاهلێکی نیوە زمانی وەکو تۆ فێرکەم؟

میناغا: ببورە مەبەستم ئەوە نەبو؟

ساڵە: کوا کچە نەخۆشەکەت؟

میناغا: لەو دیوە...

ساڵە: ناوی چی‌یە؟

میناغا: ناوی شەرمینە قوربان.

ساڵە: ئەهلا، ئەهلا ئەهلا،

میناغا: بەڵێ؟

ساڵە: بانگی کەن.

میناغا: بەڵێ باشە.

ساڵە: (دائەنیشێ) چاک تۆشبوم، ئەمەم لە کوێوە بۆ پەیاب و، خەڵکی20–30 ساڵ ئەخوێنن ئینجا ئەبن بە دوکتۆر، من بە نیو سەعات.... بەراستی سەیرە...

ماڵە: (دێتەژوورەوە، دەست بەسنگەوە) گەورەم ئەمرێ خزمەتێ؟

ساڵە: لەگەڵ هەرکەسێکدا، تەڵەکەبازی ئەکەی لەگەڵ منا نا.

ماڵە: چون قوربان؟

ساڵە: تۆ تەنیا خزمەتی خۆت ئەکەیت، چاوت بەکەس هەڵنایە ماڵە، بێ دەنگ بەو بەس، من تەفکیر ئەکەمەوە.

میناغا: (دێتەژوورەوە) ئەوا شەرمن هات گەورەم تکایە زو گرێی زمانی بکەرەوە.

ساڵە: بەڵێ گرێی، گرێی کردنەوە زۆر پێویستە، باوباپیرانمان وتویانە گرێێ دەست مەخەرە دان، بوقرات وتویەتی ئاگاتان لەگرێ کوێرەبێ، دایک بەکچی ئەڵێ یاخواگرێێ بەختت بکرێتەوە، تۆش ئەڵێی گرێی زمانی شەرمن بکەرەوە....

میناغا: بەڵێ، بەڵێ، بەراستی ئێوە تێگەیشتون.

ساڵە: من چاوەڕوانی کچەکەتم، من پەرۆشم و هەمو دەرمانێکی دوکتۆریم بۆ ئامادە کردوە.

میناغا: کامەتا دەرمان، هیچ نابینم.

ساڵە: (پەنجە درێژ ئەکات بۆسەری) والێرەدا... ناوت چی‌بو؟

میناغا: من ئەفەموی؟

ساڵە: ئا.

میناغا: میناغا.

ساڵە: مینە یان مینا؟

میناغا: میناغا... میناغا.

ساڵە: هاها، میناغا میناغا، میناناوی پیاونی‌یە، ناوی ئافرەتە، باوکت بۆوای ناو ناوی؟

میناغا: بڵێم چی قوربان.

ساله: کەواتە تۆمیناناغانیت.

میناغا: ئەی چیم؟

ساله: تۆ میناپوری نیت، پورە مینا... ئاوا... ئەبێ هەڵی گێڕینەوە وەك ئەعنا...

بوقرات لە بابەتی کڵاوو جامانەدا وتویەتی:

هەی هەی لەم زەمانە، زاوائەبێ بەبوکێ،

مقدراتی قەومێ ئەدرێ بە نێرەموکێ

میناغا: چیە قوربان ئەم قسانە؟

ساله: عیلمــن، ئــەدەبێ، هونــەرن، فەلســەفەن، رۆشــنبیرین، شەرمن"دێتەژورەوە وە نەریمان لەدوایەوە"

میناغا: ئەوە شەرمنە جەنابی دکتور.

ساله: تەبعەن شەرمنە، ئەی گوایە ئەتەوێ بەکێی تێ بگەم؟ بەخازە؟

میناغا: بەڵێ قوربان.

ساله: ست داون (روئەکاتە میناغا)

میناغا: بەڵێ؟

ساله: یەعنی رۆنیشە

میناغا: بەڵێ؟

ساله: دانیشە، ئۆتر، ئوگعد

میناغا:(پێ ئەکەنێ) ئێ ئێ تێکەیشتم.

ساله: (روئەکاتە شەرمن) تۆش بنیش.

میناغا: جەنابی دوکتۆر هەر ئەم کچەم هەیە و زۆرم خۆش ئەوێ.

ساله: من بڕوام بە قسە نییە، بڕوام بە کردارە. (ئەچێتە تەنیشت شەرمنەوە دائەنیشێ) کچێکی جوان ئەبێ شو بە کوڕێکی جوان بکات، ئەبێ شو بەو کەسە بکات کەدڵداریەتی کە حەزی لێ ئەکات...

شەرمن: شەرمن (زەردەخەنە ئەیگرێ)

میناغا: شوکر پێکەنی، شوکر پێکەنی.

ساله: ئێ شەرمنی جوان، کچی مامۆستا مینە.

میناغا: قوربان من ئاغام.

ساله: قسەم پێمەبڕە من خەریکی دوکتۆری و عیلمم. کوێت ژان ئەکات؟

شەرمن: (دەست ئەبات بۆدەمی، ئنجا سەری ئینجا چەناگەی و ئەڵێ) هان هی هۆن.

ساله: (ساله دەست ئەبا بۆدەمی بۆرومەتی و بۆ دڵی و ئەڵێ) تو غەڵەتی، هان، هی، هون.

شەرمن: شەرمن (رۆی زۆرخۆش ئەبێ زەردەخەنە ئەیگری)

ساله: (رو ئەکاتە میناغا) تۆ لە زمانی هان هی هۆن ئەگەی؟

میناغا: نــەخێر قوربــان، ئــاخر ئــەم لالییەیــە کــە شــوکردنەکەی دواخستوە.

ساله: گوایە بۆ دوای خستوە؟

میناغا: چونکە هەتا ئەم لاڵییەی چاك نەبێتەوە کابرا نایهێنێ.

ساله: وادیارە ئەم کابرای خوازبێنیکەرە زۆر گەوجە، ئەگینا پیاو هەیە لە دنیادا حەز ئەکات ژنەکەی لاڵ نەبێت؟ بەشبە حاڵی خۆم خازەی ژنم لاڵ بێ بە ناموسم حەوت شەوو حەوت رۆژ لە خۆشیانا هەڵئەپەڕم.

میناغا: تکات لێ ئەکەم زووچاکی بکەرەوە...

ساله:(دەست ئەبا بۆ دەستی شەرمن) ئا ئەبزی دووجۆرە، جۆرێکی هەندێ قسە هەر ئەکات بەڵام بەگران، ئەوعێکیش هەر قسەناکات، یەعنی لە قسەی ناگەین، مەسەلەت ئەڵێ:" ئەبەبا... ئەتەتا... ئەقەقا... ئیمە عالمین زوولە هەموشتێك ئەگەین.

میناغا: باشە جەناب ئەم نەخۆشییە لەچییەوە پەیدائەبێ؟

ساله: ئاسانە، هەرگۆیشی مەدەرێ ئەرەستۆ لەدەروازەی زمانا ئەڵێ: زمان ماسولکەیەکی ماسولکەیی پانودرێژە و نەبەستراوە بە کاسەی سەرەوە و دێت و ئەچێ و، بەڵایەکە خوا توشی بنیادەمی کردوە، باووباپیرانیشمان وتویانە ئەگەر زمان بێڵێ سەر ڕەحەتە، شتی قۆڕوناشیین و خراپ و چەوت، پیاوی گەندەڵ و بێ تواناو نەزان ئەبینین، زمانمان ئەخەینەکار قسە ئەکەین جنێویە چەوتی و، بە ناڕاستیو، بەدزی، جنێو بە گەندەڵ و نەزان و بێ توانا وساختەچی و دەست بڕ ئەدەین، بێ گومان ئەمانەش شتیان بەدەستەو دەستمان لێ ئەوەشێنن. ئنجا پیاو زمانی نەبێ باشە وەنە.

میناغا: قوربان مەبەستم تێ بگەین، لاڵی لە چییەوە پەیدا ئەبێ؟

ساله: خۆی هەڵم، بەڵێ هەڵم لە ناوسکاپەیدا ئەبێ ئەکشێ بەرەوژووری ئەیدا لە ئاسمانی ورگ-گەدە، لێوەی ئەپەڕێ، ئەیدا لەرۆخی جگەر، تێ ئەپەڕێ ئەیدا لە نێرکەی دڵ....

ماله: قوربان دڵ نێرکی هەیە.

ساله: ئەی نەفام، نێرکی هەیە، گوێچکەی هەیە، ژوری تیایە...

نەریمان: قوربان عەفوی‌کە نەزانە نەزان(بەماله) هەتیو بێ دەنگ بە هەتا باسی قاچوقولیشی نەکردوە.

ساله: بەڵێ، ئێوە کامتان لاتینی ئەزانن؟

(هەرسێکیان بێ دەنگ و تەنیا سەر ڕائەوەشێنن)

ئەی جاهیلی نەفامینە، بەنەخۆشی زمان لاڵی ئەوترێ: لاڵێست-دڵداریس خەمخواریس. بەڵێ ئینجا ئەو نێرکی دڵە ئەلەرێتەوە، ئەلەرزێ، ئەبێ بەهۆی لاڵ و ئەمەیە نە خۆشی و هۆی نەخۆشی.

نەریمان: ماشاالله لە عیلم، ماشا الله لە رۆشن بیری،

ماله: ماشا الله لە سیاسەت.

ساله: هەتیو ماله گەر سیاسەت عیلاقەی چییە بەلاڵی زمانەوە؟ هەی جاهل؟

میناغا: وس بە ماله، ئێ قوربان دەرمان چییە بۆ نەخۆشییەکە؟

ساله: ئاها.... هاها.... دەرمان؟

نان و شەراب، بەڵێ نانو شەراب.

میناغا: ئینجا نانوشەراب دەرمانە قوربان؟

ساله: تەبعەن دەرمانە، تۆ ئەیزانی یان من؟

میناغا:جەنابت ئەیزانی، بەڵام بۆچی؟

ساله: چونکە توتی، بیبی مەتۆ، ببغا، بە نانوشەراب دێتە زمان.... دەی بڕۆن نانو وشەراب بۆ ئەوو خۆراك بۆمن جێ بەجێ بکەن تائەختێك ئیسراحەت بکەم.

میناغا: ئادەی کوڕە، ئادەی خەریك بن.

پەردەدا ئەدرێتەوە

## پەردەی چوارەم

دیکۆر-ئەری پێشو

(ساله لە سەر قەرەوێڵەکە با[illegible] ئە ترسەوە دێتەژورەوە)

نەوزاد: گەورەم، کاک دوکتۆر، گەورەم..

سالە: (بەرز ئەبێتەوە) وەرە، وەرەپێشەوە، کێت ئەوێ؟

نەوزاد: جەنابت

سالە: ئەمرێ، خزمەتێ؟

نەوزاد: داوای یارمەتیتان لێ ئەکەم گەورەم؟

سالە: بێنە دەستت، (نەبزی ئەگرێ) ئۆو نەبزت سێ لۆنەیە.

نەوزاد: من نەخۆش نیم گەورەم

سالە: وانەڵێی بێ ئەقڵ، کەس هەیە لە دنیادا نەخۆش نەبێ؟ یەکێک نەخۆشی پارەیە. یەکێک نەخۆشە بۆ کورسی، یەکێک نەخۆشە بۆ پایە، یەکێک نەخۆشە بۆ ماڵوێران کردنی خەڵکی. هەمو نەخۆشین هەموو دەردەدارین..

نەوزاد: من نەخۆشی دڵداریم قوربان.

سالە: وابڵێ گەوجە، ئێ، قسە بکە.... قسە بکە....

نەوزاد: قوربان من حەزم لە شەرمنە و شەرمنیش حەزی لە من کردوە. بۆیەش خۆی لاڵ کردوە چونکی باوکی پیارێکی پولەکییە و ئەیەوێ کچەکەی بدا بە کابرایەکی دەوڵەمەند.

سالە: تۆ دەوڵەمەند نیت؟

نەوزاد: نەخێر فەقیرم.

سالە: باوکت، خاڵت، مامت دەوڵەمەند نین؟

نەوزاد: مامم دەوڵەمەندە و پیرەو سەری لە گوێی قەبر ئەلەرزێ.

سالە: ئاە، ئەمەشتێکی باشە، بەڵکو ئەمە خوایە بمرێ و هەمو سەروەتەکەی بە تۆ بڕێت و ببێت بەیەک شەوە.

نەوزاد: دەم خۆش قوربان، ئێستاش تکا ئەکەم ئەمەم لێ وەربگرە (پارەی ئەداتێ).

سالە: ئۆو وادەرئەکەوێ تۆ ئسوڵ ئەزانی.

نەوزاد: بەڵێ گەورەم، بمکە بە مزمیدی خۆت بەڵکو بیبینم و دووقسەی لەگەڵا بکەم.

سالە: ئەوار لەم ساتەوە تۆ مزمیدی، راوەستە (دەست ئەکا بە ژماردنی پارەکە) ئاە، ئافەرم، ئۆغڵم ئۆغلانم، برۆ مۆزەف صحیبە، یاللە.

نەوزاد: زۆر سوپاس گەورەم (بەهەردوودەست) تەمەننا ئەکات. ئینجاگەورەم شتێکیشم فێربکە لە عیلم.

سالە: کام عیلم کوڕم؟

نەوزاد: عیلمی دکتۆری.

سالە: (قاقاپێ ئەکەنێ) خۆشی خۆش ئەشکە.

نەوزاد: بۆچی قوربان؟

سالە: لام وایە خۆم زۆرنەزانم تا فێری تۆی بکەم.

نەوزاد: چۆن قوربان، ئەی دوکتۆر نیت؟

سالە: کورە دکتۆری چی بێ ئەقڵ؟ هەموو خوێندەواری من هەتا صنفی شەش بوە، بەڵام ئەوەتا بە زۆری زۆردارەکی کراوم بە دوکتۆر بە لێدان، بەدار، بەڵام ئەم پیشەیەم پێخۆشە و یاخوا هەتا سەربێ، ئەوەی چاک ئەبێتەوە دەبیێتەوە، ئەوی ئەشمرێ لە ئامانەتی خوادابێ. کەس نیە ئەمرێ کورم، هە موو هەرئەمرین.

نەوزاد: گەورەم، دوکتۆربی و دوکتۆرنەبێ لەلای من پیاوی چاکی.

(دوو زەلام دێنەژوورەوە، پیاوێک و کوڕەکەی)

پیاو: قوربان، خۆم و کوڕەکەم هاتوینەتە خزمەتت.

سالە: خزمەت لە منەوە، چیتان ئەوێ؟

پیاو: دایکی کوڕەکەم ناوی ڕحمەیە...

سالە: یەعنی بەرەحمە، بەزەیی بە خەڵکادێتەوە؟

پیاو: نەخێر قوربان ناوی رەحمەیە.

سالە: چیە ئەم قسە بێ مەعنایە؟ داخڵبە.

پیاو: داخڵی چی(ئاوڕ ئەداتەوە بەملاوبەولادا).

سالە: کورە داخڵی مەسەلەکەی بۆی هاتوی، یەعنی بۆم بگێڕەوە.

پیاو: (زەردە ئەیگرێ) ئێ ئێ، تێ گەیشتم قوربان.

سالە: ئەی بەخێر تێی ئەگەی ئاوا. دەی قسە بکە.

پیاو: ڕەحمە گوناحە،(بەکەساسیەوە)

سالە: بۆ؟ لێ یان داوە؟

پیاو: نەء قوربان گوناحە(بەگریانەوە).

سالە: کوڕم وادیارە باوکت زۆر عاقڵە و منیش بەرامبەر پیاوی وا عاقڵ کەم چیکەڵلانەم، تۆ قسە بکە.

کورە: مامە، دایکم گوناحە(بەکەساسیەوە).

سالە: توخوا؟ دایکت گوناحە(بەکەساسی و گاڵتەپێ کردنەوە) خۆم ئەبوایە زو بمزانیایە کە گیا لە سەربنجی خۆی ئەڕوێ. ئێی،(بەتوڕەیی).

پیاو: ڕەحمە نەخۆشە.

سالە: چییەتی؟

پیاو: لە دوابڕاوەکەیەتی.

سالە: دوابڕاوچی‌یە؟ کلکی نی‌یە؟

پیاو: نەء قوربان ئاوساوە.

سالە: ئەی خوا بت ئاوسێنێ وەکو منت ئاوسان. سکی پڕە؟

پیاو: نەء قوربان، هەموو لەشی پەنمیوە.

سالە: خوا بت پەنمێنێ، ئنجا چیت ئەوێ؟ ئاوساوە لە دواییا ئاوساریەکەی ئەنیشێتەوە.

پیاو: چۆن ئەنیشێتەوە قوربان؟

سالە: چەندت پارەپێیە؟

پیاو: چەند دینارێک قوربان.

سالە: بێنیە هەقی معایەنە.

پیاو: (پارەی بۆدەردێنێ و ئەیداتێ). دەی قوربان.

سالە: دەی ئینجا مەعقولە، وتت گوناحە، ئاوساوە، پەنمیوە؟

پیاو: بەڵێ گونا.....

سالە: هوس، هوس، ئەیزانم، ئەو ئافرەتە لە داخا ئاوساوە.

پیاو: لەداخی چی قوربان؟ بەشەرەفم داخم نەکردوە.

سالە: لەداخی بێ ئاشی و بێ ئاوی و بێ جلوبەرگی و بێ خشڵی ئاوساوە.

پیاو: هەمووی هەیە قوربان. لە هیچی کەم نیە.

سالە: کەواتە لەداخی زۆرزانی و زیرەکی تۆ ئاوساوە هەی قوماربار؟

پیاو: (زەردە ئەیگرێ و قسەناکات)

کوڕ: نەوەڵلا وانییە. هەموو جارێ دایکم پێی ئەڵێ گەلۆر، گەندەڵ، گەلحۆ، دایکم گوناحە.

ساله: دایکت زیرەکە، دایکت عاقڵە، دایکت هەق وایە داخڵی مجمع بکرێ چونکە بە پێی وشە قسە بە باوکت ئەڵێ.

پیاو:قوربان دەرمان، مەسەلەی ئاوساوییەکە؟

ساله: ڕەحیمست ئاوساویست، پیاوگەوجیست نەفامیست، ناقص تەقسیم، زائید، زەربیست، ئوموغەڵەت. کەکۆر و گەلحۆر گەندەڵ مساوی پیاو. شعور زائید ئیدراك زائید قسەی خەڵکی: ئۆ عەمرەکەم نەمێنێ بۆ چ شویەك کە تۆ کردت مساوی ئاوساوی. دوزیمەوە.

پیاو:چیت دۆزییەوە قوربان؟

ساله: دەرمان، فستق.

پیاو: فستق؟

ساله: گوێ بگرە کابرا: توتی، بیبی مەتۆ، بە بەغا تەیرە یان نا؟

پیاو: نازانم قوربان.

ساله: تەیرە، ئەم تەیرە قسەئەکات، بۆ قسە ئەکات چونکە فستق ئەخوات، فستق مێشکی ئەکاتەوە، زیرەکی ئەکات، تۆش لە مەودوارە هەمووڕۆژێك لاله پێنچێك فستق ئەخۆی.

پیاو: من بیخۆم؟

ساله: بەڵێ تۆ ئەیخۆیت، لە پاش هەفتەیەك زیرەك ئەبیت، ڕەحمە چی وت تۆ ئەوە ئەڵێیتەوە، ئنجا ڕەحمە پێئەکەنێ، ئنجا ڕەحمە مسرور ئەبێ، ئنجا هیچ داخێکی لە لەشا نامێنێ و ئاوساوی یەکەی ئەنیشێتەوە.

پیاو: ئەی بژیت بۆچ دوکتۆرێکی.

ساله:(ڕوئەکاتە کورە) ئاگات لە باوکت بێ دەمی ئەوەستێ لە فستق خواردن. یالله بڕۆن(هەردویکیان ئەڕۆن)

ساله: ئێی ئەوزاد

ئەوزاد: بەڵێ قوربان.

ساله: تۆ لەگەڵ فستق خواردنا چۆنی؟

ئەوزاد: وەڵڵا قوربان من ناو بە ناو ئەیخۆم.

ساله: بەڵام کە ئینشا الله ژنت هێنا بە دائمی بیخۆ.

ئەوزاد: ئەمرەکەی.

(میناغا دێتەژوورەوە)

میناغا: هیوام وایە جەنابتان ئیسراحەتێکی باشتان کردبێ.

ساله:من قەت ئیسراحەت ناکەم هەتا هەرچی نەخۆشی هەیە لە ناو نەبرێت.

میناغا: بە خزمەت ئەم زاتە ئەگەیشتوم.

ساله: لە خزمەت منایە، بەردەستیم ئەکات، ئیشی هەیە و ئیشی پێئەسپێرم. شەرمن خان چۆنە؟

میناغا: ئیستا ئەویش دێت، بەڵام جارێ هەر قسەی نەکردوە.

ساله: بەسیتە، بەسەری باوکت بەم زوانە قسە ئەکات.

شەرمن(دێتە ژورەوەچاوی بە ئەوزاد ئەکەوێ ئەگەشێتەوە)

میناغا: دانیشە کچم

شەرمن (دائەنیشێ)

ساله: (ڕوئەکاتە ئەوزاد) وەرەپێشەوە، ئەبزی بگرە (قۆڵ ئەکات بە قۆڵی میناغا داو پشتیان تێئەکەن) عولەمای گەورە هێشتا بڕیاری تەواویان نەداوە.دەربارەی ئەوەی کە کامیان زوتر چاك ئەبنەوە؟ پیاو یان ژن، هەندێکیان ئەڵێن ئەمیان و هەندێکیان ئەڵێن ئەویان. بەڵام من بە هەمو لەخرێکەوە ئەڵێم هەر دوکیان.

میناغا: بۆچی قوربان؟

ساله: ئا . وتت بۆچی؟ باپێت بڵێم. ڕۆژ ئەسوڕێتەوە و پرشنگی جوان پەخش ئەکات، مانگ بەڕۆژ ئەچێتە ناوکولانەوە و خویمان لێ ئەشارێتەوە.

میناغا:مانگ ئەچێتە کولانەوە؟

ساله: تەبعەن ئەی گوایە کە ڕۆژ دەرکەوت ئەو لە کوێ بنوێ؟ نابێ ئیسراحەت بکات؟

میناغا: بڵێم چی؟ قابیلە مانگ مریشك بێ؟

ساله: ئافەرم، ئەرێ وەڵا مریشکە، بیلزەبت مریشکە، بەڵام مریشکێکی ئاسمانییە و هێلکەکانیشی شتێکی سەیرن.

میناغا: هێلکە؟ هێلکەی چی؟

ساله: هێلکەی بێ زەردێنە، هێلکەی ئاسمانی، ئەستێرە (ئەکێشێ بە میناغادا) ئەستێرە هێلکەی مانگە.....

شەرمن: بەخوا قسەم یەکە و نابێ بەدوان.

میناغا: ئەوە خۆقسەی کرد، سەد شوکر خوا، ئەی بژیت دوکتور.

شەرمن: بابەگیان، ئەمەوێ پێت بڵێم ئەگەر لە توکوتم کەی هەر شوئەکەم بەوکەسەی کە خۆشم ئەوێ، شوناکەم بەو کابرایەی هاتبو بۆ خوازبێنیم.

میناغا: وزیە کچم، ئیستاوەختی ئەو قسانە نییە.

ساله: وەختیەتی، دەی قسە بکە باقسەت لە بیرنەچێتەوە، ئافرەت چۆن ئەتوانێ قسە نەکات؟

میناغا: رجا ئەکەم دوکتۆر.

ساله:هوس، لاتتکلم. خەریکی ئیشم لێ تێك ئەدەی؟ شویە و کەسەئەکات کە حەزی لێ ئەکات.

شەرمن: بەخوا بابە بشمکوژی هەر ئەوەیە کەپێم وتی...

میناغا: توخوا ئەمە وەزعە؟ ئەمە حاڵە؟ ئەمەچ دنیایە کە کچ بتوانێ بێ ئسوڵی بکات؟

ساله: بێ ئسوڵی ئەوەیە بە زۆر کچێك بدەی بەدەوڵەمەندێکی پیری پەك کەوتە. ئسولیش ئەوەیە دودڵ، دوگەنج لەیەك ئەکەی.

مامۆستا سەماوەر لە بنمیچی شەشەمی ژن هێنان و شوکردنا فەرمویەتی: هەرچی کچ هەیە ئەبێ شوبکات، هەرچی کوڕ هەیە ئەبێ ژن بهێنێ مامۆستا قورەڕەشیش ئەڵێ: خێزانی بەختیار لە ماڵی پڕ خۆشەویستی و دڵداریدا پەیدائەبێ....

میناغا: بەسە رجات لێ ئەکەم، بەسەری باوکم ئەمشەو مارەیئەکەم لە....

ساله: ئەی لێی، ئەوەك زمانی بچێتەوە کلیل.

میناغا: چش، بابچێتەوە کلیل ئەمەوێ لاڵ ببێتەوە.

ساله: (قۆڵی ئەگرێ و قسەی بەگوێدا ئەچرپێنێ) ئەتەوێ شوبکات بە کابرا؟

میناغا: ئا، ئەمەوێ، ئەی چی؟

ساله: ئەو یارمەتیدەرەم شارەزایە، با لەگەڵیا بڕواتە ناو باغەکەو لەوێ قەناعەتی پێ بکات، هەموشتێك لەم دنیایەدا بە قەناعەت ئەبێ نەك بە زۆرەملە.

میناغا: بەسەری باوکم من موافقم.

ساله: (وەرئەچەخێتەوە بولای شەرمن و ئەوزاد) بڕۆن بۆ ناو باخەکە، دڵدارییزم، رابواردنیزم، قەناعەتیزم، یەللەبۆناوباخ.

(هەردووکیان ئەچنە دەرەوە)

میناغا: لەو قسانەی جەنابتا ئاو باخو قەناعەت تێ گەیشتم، بەڵام ئەوانی تر...

ساڵە: پێویست ناکات، ئەوانەدەرمانن لە کاتی پێویستا بەکارئەهێنرێن...

میناغا: کەزانیم کچەکەم حەزی لەو هەتیوە ناچسنە کردوە کە ناوی نەوزادە ئیتر ئەم هێشت بچێتەدەرەوە بۆ ئەوەی نەی بینێ.

ساڵە: چاکت کرد. مامۆستا دەسکە قۆریەی دوەم لە پەراوێزی کتێبی داری واوەیلادا ئەڵێ: لەبێ خەبەران کەشکەك... ئەشکە، مەنگوس.

میناغا: تێ نەگەیشتم؟

ساڵە: قەیناکا با تێنەگەی باشترە، چونکە کە پیاوتێ گەیشت ماڵی وێران ئەبێ دوژمنی بۆ زۆر ئەبێ، درۆوردەلەسەی بۆ هەڵ ئەبەستن.

پیاوی عاقڵ و زانا و دانا ئەوەیە هیچ نەزانێ، بارەگوێزی لێبنێن خرەی لێوەنەیەت، هەمیشە دەست بەسنگەوە بگرێ، هەرچی یەکیان وت زەردە بیگرێ و سەربلەقێنێ.

میناغا: بەخوا دنیایەکی سەیرە، ئەم هەموو شتە هەیە لە دنیادا.

ساڵە: بەڵێ، عیلم گوناحە، زانین گوناحە، راستی و هەق وتن گوناحە.

میناغا: ئەمەیان چییە جەنابی دوکتۆر؟

ساڵە: ئەمەیان لە کتێبی ابنی رەحمە-کوڕی رەحمەوە-وەرگیراوە بەدەسکارییەوە

ماڵە: (بەهەڵەداوان دێتەژوورەوە) قوربان، ئاغا، شەرمن خان وکوڕەکەی لەمەڕ دوکتۆر رایان کرد.

میناغا: چۆن شتی وا ئەبێ؟ ئەی ئەو حەزی لە یەکێکی تر نەکردوە؟

ساڵە: نەء، هەر حەزی لەم کردوە، ئەوە نەوزاد بو، دڵدارەکەی شەرمن.

میناغا: کەواتە تۆ ئەم کەینوبەینەت بۆ من دروست کردوە.

ماڵە: بەڵێ قوربان، هەموفیتەکە واڵە ژێرسەری ئەم جامبازەدا.

میناغا: دەی نەریمان، ماڵە، پەلی ببەستن، وائێستا خۆشم ئەچم پۆلیس ئەهێنم لە مەرکەزەوە(دەست ئەکەن بەپەل بەستن لەپشتەوە)

پەردەدا ئەدرێتەوە

## پەردەی پێنجەم

(ساڵە لە سەرزەوی کەوتوە، ماڵە و نەریمان راوەستاون یەکی دارێك بەدەستەوە)

خازە: ئۆی بە قورگیرێ، ئەمەچی بو ئەم رێ دووردرێژە؟ بە خۆڕایی ناویان ئەناوە دێی قوڵتاش، روئەکاتە ماڵە کوانی دوکتۆر.

ماڵە: دوکتۆر؟ (پێ ئەکەنێ) پشت بە خوا ئەختێکی کە ئەیدەن لە سێدارە

خازە: (ئەکێشێ بەسنگیا) ئەیەرۆ بۆ پیاوی کوشتوە، دێی سوتاندوە؟

ماڵە: نەء ئەمانەی نەکردوە بەڵام جامبازی کردوە.

خازە: ئینجا جامبازی‌کەی خراپە؟ هەرچی خەڵکی هەیە هەریەکە بە شێوەیەك بۆسودی خۆی جامبازی ئەکات.

ماڵە: کچی ئاغامانی بە فراندن داوە.

خازە: ئین ئین، ئینجا لە سەر ئەمەیە ئەیخنکێنن.

ماڵە: بەڵێ

خازە: ئەی کوا لە کوێیە ئەمەوێ بیبینم.

(هەڵی ئەگێڕنەوە بۆ ئەمدیوودای ئەنیشێنن)

نەریمان: ئەوەتا، فەرمووبیبینە.

خازە: ئۆی عەمرەکەم ئەمێنێ ساڵە گیان، ئەوە تۆی وابە کزی ئەت بینم.

ساڵە: قسەی بێ مەعنا مەکە خازە.

خازە: داری خۆت بېڕیایە و رازی بویتایە بە ژیانی خۆت و تۆزێکیش لەگەڵ منا نەرمونیان بویتایە باشتر نەبو؟

ساڵە: لەسەری مەڕۆ، لەمەودواوە منیش فستق ئەخۆم.

خازە: (پێ ئەکەنێ) قوڕبەسەرت وا تۆ ئیعدام ئەکرێی، فستقی چی، ئینجا من پارەی دەنکە کولەکەم نییە تۆبەی فستقە ساڵە گیان؟

ساڵە: خازە(هەڵدەستێتە سەر پێیان)

خازە: ئەڵێی چی ئامۆزاگیان

ساڵە: ساڵە گوناحە

خازە: ئامۆزاگیان.

ساڵە: گیانی ئامۆزا خازەگیان.

خازە: خازەش گوناحە....

ساڵە: دەبڕۆ ئیتر لە کوڵم بەرەوە.

خازە: بەخوا ناڕۆم هەتا مەڵت ئەواسن و ئەشت نێژن.

ساڵە: ئەی بەڵام لێ دای بۆچ ژنێکی ئاوا.

(میناغا-دوو پۆلیس- معاونێك دێنەژوورەوە)

میناغا: فەرمو بیبەن قوربان.

ساڵە: ناکرێ کوشتنە کە بگۆڕن بەلێدان، بەحەپسی.

معاون: نەخێر.

ساڵە: کورە بەدەست خۆتانە دەبیگۆڕن و بېڕێتەوە...

(نەوزاد و شەرمن دێتەژوورەوە)

ساڵە: ئەوا هاتنەوە، سەد شوکرخوا.

نەوزاد: مامە میناغا.(نامەیەکی بە دەستەوەیە)

میناغا: قوزەڵقورت، هیچ شەرم ناکات پێم ئەڵێ مامە.

نەوزاد: ئەوە وەسیتەکەی مامە حاجی وەسمانیەکم، ئەمری خوای بەجێ هێنا، هەموو سەروەتەکەی داوە بە من.

میناغا: (کاغەزەکەی لە دەست وەرئەگرێ و ئەیدا بەمعاون)

معاون: (ئەیخوێنێتەوە) بەڵێ تەواوە، 20هەزار قران، مۆروشایەتی موعتەبەر، جوتە برای بازرگان و قۆنتەراتچی بە حورمەت.

میناغا: (بەکەیف خۆشی و تعجبەوە) بە سەری باوکم پێم خۆشە، بیست هەزارقران(ئەچێت ناوچەوانی نەوزاد و شەرمن ماچ ئەکات)

ساڵە: (بەتوڕەییەوە) دەدەستم بکەنەوە ئیتر،(دەستی ئەکەنەوە) دەستمان بکەنەوە بابنوسین، دەممان بکەنەوە باقسەبکەین، گوێمان بکەنەوە بابیستین، چاومان بکەنەوە بابنین.

دووردڵ لەیەك مەکەن، کرداری ناشرین مەکەن، بەیەکێتی و بە ئازادی و بە برایەتی هیچ مشکلەیەك نییە چارەسەر نەکرێ.

(پەردە دائەدرێتەوە)

هەموونوێنەرەکان دێنەوە سەرشانۆ بەرێز پەردە سەر لە نوێ ئەکرێتەوە....

دائەدرێتەوە.

کۆمەڵێك بەرهەمی هەمەچەشنی هونەرمەند و ئەدیب ڕەفیق چالاك

# لە مەیخانەی ژیاندا (١)

## ڕەفیق چالاك



مەیخانەی ژیان سێ ساقی تیایە، ئەگەر بانگت کردن بەپەرداخ و هەڵپەرکێوە دێن، لێووچاویان زەردەخەنەی گاڵتەپێکردنی تیایە. یەکەمیان منالێکە هەمیشە منالەو عمری پێنج ساڵە، پێی ئەڵێن(دڵداری)، دووەمیان پیاوێکەو هەمیشە پیاوە و عمری چل ساڵە، پێی ئەڵێن(شەیتان)، سێ هەمیان بێعمرە پێی ئەڵێن(مردن)، مردن پیاو ماقوڵی ئەم مەیخانەیەو ئەو کەسەیە کە هەرگیز بیرم لێ نەکردۆتەوە کە لێی نزیك ببمەوە، لەبەر ئەو حەز ناکەم لە بەردەمی مەیخانەکەدا بخۆمەوە!... حەز لەوێنەو ڕاوەستانە ناشیرینەکەی ناکەم، حەز ناکەم مل پێچە پیسەکەی ببینم کە هەزار پینەی پێوەیە، پێکەنینە ناشیرینەکەی کە لە کۆکەی سیلاوی ئەچێ و دانە زەردە ڕزیوەکانی.

لام گرانه کە شتێکی لە دەست وەرگرم و لێی نزیک بکەومەوە. بەلام(شەیتان) سەرسام ئەبم لە دەمو زمانی لوسی و زیرەکیەکەی. ئەگەر ئەمزانیایە کەرا حکمی بەسەرا دراوەو لەوانەیە کە ڕابوردویەکی خراپیان هەیە ئەچوینە پەنایەوە منیشو کڕیارەکانی تریش. بەلام دڵداری، وەی لەم مناڵە، ساوا، کوریە جوانە!...

بە جوانی و نەرمی دیلم ئەکا، بەڵێ ئەو یەکەم ساقیەکە هەموشتێکی لێ وەرئەگرم، بێ دوو دڵی، بێ ئەوەی لێکی بدەمەوە کە ئەو شتەی ئەمداتێ زەهرە یا شەمپانیا:.... پار بە هارێ بانگم کرد بەخۆی و پەرداخەکەیەوە هات، ڕاوەستاو تەماشایەکی کردم بەنیگایەکی پڕ سیحرەوە و بەزەردەخەنەیەکی پڕ معناوە کە ئەو حەلە ئەمئەزانی یعنی چیە:- چیت ئەوێ؟ . بەخشیش؟.... نەء... ئەمەوێ داوای هیچم لێ نەکەی لە پاشا نابێ داوای بەفرم لێ بکەی ئەگەر داوای توزێ بەفرت لێکردم لە پاشا بۆت نامێنم.... مەترسە... داوای هیچت لێ ناکەم... نە بەفرو نەسیفون. دەستم دایە پەرداخەکە بەلام ڕای وەستانم؟ غافڵی کردم و پەرداخەکەی ڕفاند و ئەختێك ڕۆی و لە پاشا پێکەنی، پێکەنینێکی مناڵانەو بەزمانێکی فریشتەییەوە وتی: ئازارت ئەدەم... بەلام من گوێم لێ نەبوو هیچم ئەدی شتێك نەبێ: ئەویش ئەوەبو کە پەرداخەکەی هەلگرت و دورکەوتەوە، لەرزیم و بانگم کرد:- پەرداخەکە بێنە ئەی مناڵ... لەلێومی نزیك کردەوە و بە ئاوازێکی مۆسیقاییەوە وتی:- ئازارت ئەدەم.- پەرداخەکە بێنە ئەی مناڵ.-لەپاشا بەلەعنەتم ئەکەن.- من؟؟!-لە پاشا قینت لێم ئەبێ.

-من بەندەی تۆم- پەرداخەکە بێنە.- وەریگرە!...

ساڵێك ڕابورد... ئەی مناڵ. ئەی مناڵ!-چیت ئەوێ؟-بەفر. خێرابە، بەفر.-پێم وتی -تکات لێ ئەکەم پارچەیەك بەفر.-پێم وتی پارچەیەك بەفر، چیت ئەوێ ئەتدەمێ.-ئەوی ئەتەوێ لای ئەستێرەیە دوور مەکەوەرەوە، گاڵتەم پێمەکە! ، بەجێم ناهێڵی تا بەفرم بۆ ئەیەنی.-لای ئەستێرەیە ئەوی تۆ ئەتەوێ!.- هەڵت خەڵەتاندم ئەمزانی مناڵێکی پاك و جوان زاتی ئەو تاوانەی هەیە! لە جیاتی ئاوی ترێ ئاوی ئاگرم ئەداتێ! ترێ و ئاگر ئای کە بەسەزمانی! شەراب و ئاگر عنصری ژیانمن، ئەوان ڕەنگی ڕوومەت و ڕەنگی شەرابمن.-پارچەیەك بەفر، چیت ئەوێ بۆ تۆ! ،-گرانە.-بەزەییت پیاما بێت.-ئەگەر دانا بویتایە ئەتزانی کە بەفرلای من نیە.-بۆچی؟ بۆچی؟ ... لە خاوەنی مەیخانە بپرسە.- ڕزگارم کە لەعنەتی خوات لێبێ.- بەفرلای من دەست ناکەوێ.- ئاخ و داخ ئەی ناپاك ئێستاچی بکەم.- یەکێکی تر بانگ کە.- یەکێکی تر؟ کێ، کێ؟... "دڵداری" چوو بۆلای شەیتان، بەگوێ یا سرپاندو بەدەستی ئیشارەتی منی بەسەزمانی کرد، شەیتان ڕووی تێ کردم: -منم... چیت ئەوێ؟ من خواستی تۆ بەجێ ئەمێنم.. ئەمرکە بە گوێت ئەکەم!... شەیتان! .. خزمەتکاری... نەء هەرگیز نابێ، تۆ ڕابوردوت خراپە.- بە خوای تۆ هیچم لەسەراسبات نەبوە... بڕوا بەقسەی مەردم مەکە.- بەچیا ئیسباتی ئەکەی کە تۆ پاکی؟ -هانێ ئەمە"شهادتەکەم" سپیە وەکو دڵی مناڵ!!- ئایا درۆ نیە؟ بەلام هەرچۆنێك بێت ئێستا من پێویستم پێتە.. گوێت لێیە؟- نۆکەرتم دڵداری گاڵتەی پێ کردم تۆڵەم بۆ لێ بستێنە.... داخی بەجەرگم دڵداری هاوڕێمە و دەسەلاتم بەسەریانیە.- ئەی‌چی بکەم؟- واز لە تۆڵە بێنەو بیرلە دەرمان بکەرەوە.- دەرمان! بەفرە پارچەیەك بەفرە.. کەواتە بەفر دەرمان نیە! دەرمان هێنە چیە؟ چیە؟ قسەبکە! ... داوای پەرداخێکی کە لە دڵداری بکە!... پێم بڵێ زەهرێکی تر، ئاگرێکی کە لە شکڵی ئاودا و لە ناو پەرداخێکی پاکا... نەء! ... جارێك خەڵەتاوم... لەکوێ ئەزانی؟ بەڵکو لەم جارەدا! وسبە ئەی قوماربازی منافق. دەرمانم بەفرە من لە هەمو کەس دەرمانی خۆم چاکتر ئەزانم پارچەیەك بەفرم بدەرێ. خێرا. بەفر . گرانە! تۆش دیسان.- بەفر لای من نیە .-چۆن چۆن؟ -لەخاوەنی مەیخانە بپرسە! ...-ئەی چی بکەم؟بەزەییت پیاما بێت! .... یەکێکی ترت پیشان ئەدەم بۆشت تێ ئەکۆشم لای چونکی زۆر لەوانەی کە هاتونە ئێرە ئەوم پیشان داون. شەیتان ڕایکرد بۆلای(مردن) چرپەیەکی بە گوێداکرد و ئیشارەتێکی منیکرد، مردن بە ئەسپایی بە زەردە خەنەیەکەوە لێم نزیك بوەوە.- کێ داوای منی کرد؟- مردن! ... ئای!... نەء، ... نەء! ... هەرگیز و هەرگیز ... ئەمە زۆر سەیرە هەموتان لەیەك ئەچن بانگم ئەکەن و پەشیمانیش ئەبنەوە، ئایا منت نەویست، حا... حا... حا.... بەڕوما مەکۆکە، لاچۆ لەبەر چاوم.- سەیرە! ... حا...حا ... کۆکەکەم ئەتترسێنێت!. ئایا وا ئەزانی سیلاویم؟ نەء بە هەڵە چویت! .- توخوا دورکەوەرەوە، دانە زەردەکانت!. دورکەوەرەوە؟. بەفر... ئایا بەفرت ناوێ؟ لای منە.. ناتەوێ؟؟ لای تۆیە؟ هەموکاتێ لای منە، لەو ڕۆژەوە کە هاتومەتە ئەم مەیخانەیەوە.- نەء لێم نزیك مەبەرەوە، پێم وتی لێم نزیك مەبەرەوە، خوات لەگەڵ.-بۆکوێ!؟ حا.- لێم دورکەوەرەوە بۆنت ناخۆشە.- بەفر. حا.حا. ئایا داوای بەفر ناکەیت؟ بەفری سپی، وەرە مەترسە، وەرە. سپی وەکو کفن! ... بم گەنێ. بم گەنێ. ئەی"دڵداری" ئەی"شەیتان"، ئەی خاوەنی مەیخانە. ڕزگارمکەن لەم نۆکەرە ئەگریسە ناپاکە.

هەمووشتێك خۆشە ئەم خزمەتکارە ساردە ناشیرینە نەبێ.

# شادییە یان شیوەن؟



رۆڵەی شیرین چالاك!

بەرۆژگێژ و وێژ و حۆل، ئارام و ئۆقرەم لەبەر هەڵگیراوە، بەشەویش.... شەوی تاریکی درێژی بێ برانەوە خەو لە چاوم ناکەوێ ناو بەناو نەبێ... نەکارم کارە و نەحاڵم حاڵە لە دەست ئەم خەڵقە بێ بارە، لە داخی ئەم چەرخە غەدداره.

ئەوانەی جاران لاف و گەزافیان، غەڵبە غەڵبو فیشاڵ و گەزارەی زمان درێژییان ڕۆژەڕێیەك ئەڕۆیشت، ئەو(هاوڕێ)یانەم کەوام ئەزانی پۆلابتوێتەوە ئەمان نا، نەغەڵبە غەڵبیان ماوە و نەلاف و گەزاف نەگەزارەیان ماوە ونەزمان، نەپۆلان و نەفافۆن... سەرکزو ملشۆڕ، لەش بەبار و دەرون زامدار، بەرۆژ گێژوویژو حۆل، نەئارامیان ماوە و نەئۆقرە، بە شەویش خەو لە چاویان ناکەوێ هەریەکە لەبەرشتێك، هەریەکە لە ترسی شتێك! ئەترسن کوڕم... ئەترسن!

یەك لە دوای یەك، تاقم لە دوای تاقم، ئەبن بەخۆڵ بۆ(پێلێنان)!!

ئای کە ئەم ژیانە پڕیەتی لە دەردی سەری، ئای کە خەڵکی ئامادەن بۆ خۆگۆڕین، بۆ خۆفرۆشتن، بۆ بە خۆڵبون! خۆزگە بە خۆزگایی خو! تۆش بتناسینایە وەك من بەلام بەبێ ئەو بەسەرهاتەی بەسەرمنا هات! بەلام کوڕی خۆشەویست جارێ تۆمناڵی؛ خۆزگە یان چاند و نەڕواو، ئاخ بەباکردن چەکی پیاوی بێهێزی بێ دەمارە.... ئەوانەی ئەبن بەخۆڵ، خەیاڵ پەرستە، خۆپەرستە، مەنفەعەت پەرستەکان! ئەوانەی ناو براون بە(ابن الوەختەکان)، مارەکەی شێخ هۆمەر لەگەردنیان ئالێ!!

شەوە و شەو، ئەقرەیەو ئەبڕە، ناو بە ناوێك ئێشچکییەك فیکەیەك ئەکا بۆ ئەوەی لە(دز)ەکانی بگەیێنێی کە شوێنی جێی دزین بەرەڵدایەو حەرەڵڵە! تاله خاوەن ماڵیشی بگەیێنێ کە ئاگادارەو پاسەوان!! ئای رۆڵەی شیرین چەند سەیرە ئەم حاڵە، شەریکی دز و رەفیقی قافڵەو هەر لە خۆیان دێ کوڕم رۆژگار و بارفێری کردون!! بەتەنیا دانیشتوم لە ماڵێکی چۆڵ و هۆڵا، مشك نەبێت هیچ گیانلەبەرێکی کەی تیانییەو بێ گومان مشك جەواڵ ئەدڕێ، بەلام چارم چییە؟ دنیایە وتێی کەوتوم، ریشەو بوە بەریشەوە و چاوەڕێم هەڵپێچرێ ئەم حاڵە!

شەوە و شەو، کەمێك لەمەوبەر هێزی تاریکی بەسەر روناکیدا سەرکەوت و تاسانی... بەلام واتێ ئەگەی بەسەریا زاڵ بوە، چونکە سەرکەوتنی شەو چەندە تاریك و نوتەك بی بە(قوتیلەیەك) ئەڕەوێتەوە! لەبەر مۆمێك دانیشتوم لە غەریبیدا ئاوارەو مات و غەمبار و لەشبەبار نامە بۆ تۆ ئەنوسم، بۆیە لەبەر مۆم چونکە جەنگە و فەرمانوایە ئەبێ هەموو شوێنێك تاریك بێ لەبەر فڕۆکەی دوژمن، وەکو شارەزای ئەو شوێنانە ئەبێ کە ئێمە خۆمانی تیا ئەشارینەوە. توخوا رۆڵە شار ئەشاردرێتەوە؟! نازانم ئێستا دایکت خەریکی چییە؟ لای‌لایە بۆ تۆ ئەکات یان بۆ ناڵەباری ژیان ئەگری؟ فرمێسك بۆ من هەڵئەڕێژێ یان بۆ نەبونی و چەرمەسەری و سزادانی خەڵکی؟!

نازانم تواناى درومانى ماوه، يان چاوى لەبەر گريان سۆماى چوه و دەزوى بۆ ناكرێ بە دەرزىيەوە؟! بار هەر چۆنێك بێ رۆڵەى شيرين بارى قەزاو قەدەرمان هەر لەسەر بارە و شانى سەبرمان ڕیشە لە ژێريا، بەڵام بێگومـان بـە كـوڕى خۆشەويستم هـەموو چەوتييـەك هـەر ئـەبێ راسـت ببێتەوە، هەموو برينێك هەر ئەبێ سارێژ ببێتەوە....

شەوە وشەو، بير لە كاروبارى رۆژانەى خەڵكى ئەكەمەوە، چەند كچى جوانى نازدارى ناو باوەشى باوك و دايك راپێچ كران بۆ خراپخانەكان! چەند بوە پياوى ناو پياوانى بە پياوەتى راهاتو ئێستا شرەيان بەبەرە وەنەماوە، لەپەنا چوخم و سـەرەرێكان كـەوتون بـە حـالْ نوزەيـان تيامـاوە و داواى پيـاوەتى ئەكـەن لـە ناپياوەكـان! نەفسـيەتى خـەڵقى بەبۆيـەى جـەنگ رەنـگ كـراوە... تـرس... ساختەچێتى، بێ پەيمانى، درۆ و دزى بوە بە پيشە، كردويانن بە سنعەت. بارى جەنگ و رۆژانى تاريكى سنعەتى وايان ئەوێ خوا بيبرێ ئەم سنعەتە! رەحم و بەزەى و دراوسێتى و خزمايەتى و هاوڕێيەتى باويان نەماوە، ئەوى نە مرۆ باوى هەيە دژەكانى ئەمانەن، باو باوى ناپياوانە و باوى ئەوانەى بێ بار و بێبەروپشتن وەك هـەڵمات! وەك نيسك! ئـاى كـە ناخۆشـە ئينسـان هەسـت بـەم شـتانە بكـاو نەشتوانێ بيان گۆڕێ، ئاى كە نازاراوييە ئينسان لە ناو كۆمەڵى واو لەگەڵ ئەم جۆرە لـە پياوچوانـەدا بـژى! پێمـان ئـەڵێن نـابێ بـە تـەماى(موعجزە) بين، نـابێ چاوەڕوانى هێزێكى دەرەوەبين، راست ئەكەن چونكە بە تـەمابون تەمەڵمان ئەكاو وامان لێ دێت بەبێ شێو سەربنێينەوە! ئاى كە بەبێ شێوسەرمان نايەوە رۆڵەو هەر دەروشمان لێ نەكرايەوە. شەوە وشەو بەڵام قافڵەيەك وا بەڕێوە، بە تاريكى مل ئەنێت بە سەر ئاوا، بە سەر بەردوشاخا، بەناوچۆڵ و بيابانى پڕ درك و داڵ و پڕ دەعبادا و هەر ئەڕوا، پڕ هيمەت و پڕ غيرەت و پڕ زات و پڕ پياوەتى... لەولاشەوە جەردەو چەتە و زۆڵەك تەدارەك ساز ئەكەن و نەخشە ئەكێشن بۆلێدانى قافڵەو بۆ لە ناو بردنى خايەو مايە... بێگومان بە رۆڵە كە هەمو قافڵەيەكى ڕێى هەق هەر ئەگاتە ئامانج بە شەرتێك شەريكى دزى تيانەبێ و سەر قافڵەباشى غەڕانەبێ و نەنەوێ و جڵەو شل نەكات.

وا دەمـەو بەيانـەو بـەحاڵ لـە دەم ئاسـۆوە تـاڵ تاڵـە كزنگـى رووناكى بـەرز ئەبێتـەوە و دنيا رووناك ئەكاتـەوە بەرەنگێكى ئـاڵى مەيلـەو سـوور... دە سوێند ئەخۆم بە ئاڵى مەيلەو سوور بە خوێنى پاكى هەموو ئەوانەى بەدەستى ناپاك و نامەردو زۆڵەك و دوژمن رژێنرا، هەرگيز رێى هەق و راستى بەرنەدەم و پيـاوى پياويش هەر يەكجار ئەژى.

من شادم بەو هيوايەى لە دڵمايە، بەو رێيەى كە گرتومە، بەو بڕيارەى كە داومە، شيوەنيش هەر ئەكەم، بەرخەكەم، بۆ ئەو زوريەى زۆرەى نە لە هيواو نە لەرێگاو نە لە بڕيار و ئامانجى جوان ئەگەن و بون بە خـۆڵ بۆپـێ لێنـان.. دنيا شادييەو شيوەن، بەڵام باشادين بەخزمەت كردنى خەڵكى و بەخۆبەختكردن بۆ ئامانجى جوان، با شيوەنيش بكەين بۆ وريانەبونەوە و لە خەوى غەفڵەتا نوستنى زوريەى زۆر... بـەرۆژگێڕ و ێـژ وحـۆڵ، ئـارام و ئۆقـرەم لەبـەر هـەڵگيراوە و بـە شەوييش، شەوى تاريكى درێژكە هەرنەبێ ببڕێتەوە خەو لە چاوم ناكەوێ چونكە وەك وتويانە پێش خزمەتان نانون شەوێ.

نـە پـۆلام و نـەفافۆن، مرۆڤم و مـرۆڤ، هـەرگيز (گـا) ناپەرستم و نايكـەم بـە پێشڕەو، جەواڵ ناخەمە بەردەمى مشك، ماڵ ناسپێرم بە ئێشكچى، هەرگيز خۆم ناكەم بەخۆڵ، پـێ نـانێم بـە هيـچ شـتێكى پـيرۆزا... ئـەم ژيانـەى ئـەمرۆى ئێمـە نەشادىيەو نە نيوە شادى، نە شيوەنى تەواوە نە نيوەشيوەن...



# دڵداری

ڕابەر*



### دڵداری کلیلی خۆشییەکی سەردەمییە، بۆ ماوەیەك کامەرانی ئەبەخشێ بەئینسان

لە سەرەتای مێژووەوە هەتا ئیستا کیمیاگەرەکان خەریکی ئەوەن(مەعدەنە) هەرزانە کەم نرخەکان بایەخدار بکەن، بیان گۆڕن بەشتی بە نرخی وەك ئاڵتون کەچی سەرنەکەوتوون، بەڵام دڵداری هەر لە سەرەتای دامەزرانی بنەماڵەی ئینسانەوە هەتا ئەمڕۆ لە توانایایەتی شەیتان بکا بە فریشتە، ساختەچی بکا بە قارەمان، ووشەی"گیانە شیرینەکەم" بهێنێتە سەر ئەو زمانانەی هەر بە جوێنی پیس ڕاهاتوون، هەر دڵدارییە کە ئینسان لە نزمییەوە بەرز، لە پەستییەوە شاد، لە پیسییەوە بەرز ئەکاتەوە بۆ پاکی. هەر دڵدارییە کەوەك خەوێکی ئێجگار خۆشی بەتام و چێژ لە پڕدێت و ئەبریسکێتەوە، ژیان ئەدرەوشێنێتەوە و ئەی ڕازێنێتەوە، بەرگی بووکێنی ئەکا بە بەردا، تارای پەمەیی ئەدا بە سەردا، لەخەو لە ناخۆشی لە تاریکی لە پەستی ڕات ئەپەڕێنێ ڕاتئەفڕێنێ، کامەرانیت پێئەگەیێنێ، خەم و خەفەتت ئەڕەوێنێ، لە باوەشی "خۆشەویستی" ئەرت ئەمێنێ. لە ئەم چەند ساڵە، یان بڵێ ئەم چەند مانگ و ڕۆژ و سەعاتە، پوختەی ژیانە گرۆشەوقەکەیەتی، ئەوی ئەمێنێتەوە داخەو ئۆف، هیوا بابردووییەو بە ئامانج نەگەیشتویی تاریکییەو یەئس، دەست بە دەستادانە، لە خۆدانە، قوڕپێوانە، شینوڕۆ، چڵوچێوە و خاشاك، دارو پەردووی کۆشکی ڕووخاوە، بەردو کەرەسەی قەڵای هەرەس هێناوە، خۆڵەمێشی هەست و هیوای سووتاوە، هەر ئازارە و ئازار هەتا ئەبرێن بۆمەزار!

بەهەر کوێرەوەریەك بوو تەمەنی گەیشتە شانزەو حەڤدە، شانزەیە یان حەڤدە، خۆشی نازانێ، چونکە خۆ باوکی خوێندەوار نەبوو وەکو باوکەکانی ئیستا دەقیقەو سەعاتی بوونی کوڕەی بنووسێ! ئەو شەوەی کە ئەم لە دایك بوو ئەو ئێشك چی بوو لە ماڵی ئاغا، زۆریشیان لەگەڵ خەریك بوو کە ئیزنی بدەن بەڵام کەس گوێی نەدایە قسەکانی، بۆ بەیانی کەڕۆژبووەوە چووە ماڵێ بە هەڵەداوان منالێکی پچکۆلانەی جوانکیلانەی دی کراوە بەمەلۆتکە! مەلۆتکە چیە؟ پەڕۆی کۆنی کراس و کەواو دەرپێی خۆی و ژنەکەی کە ئەمیش کۆنەی ئاغاو ئاغاژنە لە منالەکەوە پێچراوە. لەو ڕۆژەوە سعید هەستی بەوەکرد کە لە جاران پیاوترە و جۆرە تەزوویەکی خۆشی ناو بە ناو بە لەشی هیلاکیا تێ ئەپەڕێ کەلێکی ئەدایەوە سبەینێ(حەمە) ئەبێ بەپیاو فێری ئیشکردن ئەبێت نان پەیدائەکات یان ئەبێ بەئێشکچی ماڵی ئاغا لە جیاتی باوکی کە پیربوو! ناو بە ناویش ئەوەی لێکئەدایەوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان حەمە ژن ئەمێنێ و منالی ئەبێ. ئای کە خەوو خەیاڵ زۆرە لای ئەو کەسانەی ساکار و بارکەوتەو بێ دەسەڵاتن لەم دنیایەدا.

ڕۆژلەدوای ڕۆژ وەك منالی ناو حکایەت حەمە گەورە بوو، نار بە نار لەگەڵ باوکیا ئەچوو بۆ کۆشکی ئاغا، بەڵام نەیئەوێرا پێ بنێتە ئەودیو(حەرەم). بەترسێکەوە بۆ خۆی لەلایەکەوە ڕائەوەستا وەکو ئەو

هەموو پیاوانەی لە خزمەتا وەستاون خوا خوای ئەوەیانە ئاغا بەدەست، بەچاو، ئیشارەتێ بکات یان بەدەم قسەیەك... وورتەیەك تا لەسەر سەر بکەونە ڕێ بۆجێبەجێ کردنی چونکە "فەرمانی ئاغامان ڕەوایە"!

ڕۆژێك لە ڕۆژان باوکی لێی بوو بەدەمە قاڵێ لەگەڵ (ئەفەندی)یا ئەفەندی مامۆستای قوتابخانەکە بوو کە تازە لەو دێیە کرابووەوە و کەس نەی ئەخوێند تیایا. لە پاش هەزار مەخسەرەو بەزم و ڕەزم و ئەمبەرونەوبەر ئاغا لوتفی کردو بەری خوێندنی بەرەڵاکرد بۆ منالانی دێیەکە! لەپاش چەند ساڵێکی کەم بەشی زۆری کوڕانی پاسەوان و گاوان و شوان و جووتیاری دێ فێری خوێندن و نووسین بوون، ئەیان زانی دوانزە کەڕەت دوانزە ئەکاتە سەدو چل و چوار، ئەمە شتێك بوو لای ئاغاش وەکو تەلیسم وابوو. جگە لەوە قوتابیان چاویان کرایەوە، دەستیان کرد بە ئامۆژگاری کەس و کارەکانیان، فێری پاك و تەمیزی بوون، حەمە ئەبۆایە هەموو ڕۆژێ بە سابوونی بۆن خۆش دەست و دەم وچاوی بشتایە لە کانی. لە پۆل شەشەما بوو کە تەمەنی گەیشتە شانزەو حەڤدە! سعید پەیبوو بوو بەڵام هەر ئیشکچی ماڵی ئاغابوو، چارچیە؟ ئەی بەچی بژین؟ وابوە بە هەشت سەرخێزان، گەورەکەیان حەمەیە! ڕۆژێکیان دەمەو ئێوارەی بەهار لە ناو ئەو باخانەدا سەعی ئەکرد قیژەیەك زریکەیەك پەیدا بوو لەدوور! بەهەڵەداوان بەدەم زریکەوەچوو، کە ئەبینێ مارێکی زەلام لە نازداری کچی ئاغا هەڵساوەتە سەرکلك! ترسی مارە و جوانی نازدار بۆماوەیەك واقیان وڕکرد، بەڵام لەدواییانەیکردە ئامەردی کەوتە وەشاندنی خڕکەبەرد، ئینجا دارێکی دۆزیەوە و بەپیرەدار هاتە وێزەی پیرەمار بەشێتانە. بڵێ مارەی کوشت، بەڵام خۆشی لەولاوەکەوت و دەست بەجێ قاچی ئاوسا چونکە مارەش قەپێکی بەماکردبوو، نازدار کەمێك بەدیاریەوە هەڵوەستاو، پیاو بۆ خوا بڵێت یەك دووفرمێسکیشی ڕشت و بە هەڵەداوان ڕووی کردەوە ناو دێ. هاتن حەمەیان برد بۆ ناودێ باش بوو ئەوشەوە ڕێکەوت دکتۆر هاتبوو بۆپشکنینی قوتابیان! لە پاش چەند ڕۆژێك حەمە هەڵسایەوە و چوو بۆ دیوەخانی ئاغا لەسەر داواکردنی باوکی! لەوێ ئاغا لاواندیەوەو دوو تەنەکە گەنمی زەردکەشی دا بە باوکی لە چوونە دەرەوەدا سەری هەڵبڕی بۆ پەنجەرەی حەرەم، کە چاوی بە نازدارکەوت چاوی ئەگەشێتەوە و زەردەخەنەیەکی پڕشەرم وا لەسەر لێوەئاڵەکانی و ڕەنگی کەمێك گۆڕاوە ئیتر لەجێی خۆی وشکبوو! دڵی دەستی کرد بەگورپەگورپ، ئەژنۆی لەرزی، وڕ بو، تۆزێکی مابوو لەسەر خۆی بچێت! باوکی وەرچەرخایەوە و تەماشایەکی پەنجەرەکەو حەمەی کردو ڕاچڵەکی، بەتووڕەییەوە بەحەمەی ووت پێشمکەوە ڕۆڵە! بەحەقی خۆمان گەیشتووین حەمە، ئەکەی جارێکی تر تەماشای پەنجەرەکانی دیوی حەرەم بکەی ئەگینا کاتێك بەخۆت ئەزانی لە حەوت ساڵان ڕاست کراویتەوە!

لەو ڕۆژەوە هەتا هات حەمە باریکتربوو، گوێی نەئەدایە دەرس، هەمووشتێکی خستبوەلاوە، خەور خەیاڵی شەو و ڕۆژی نازدار بوو! وای ئەزانی ئەم دنیایە تەنیا نازداری تیایەو بێ نازدار ژیان ئەبێتە دۆزەخ! ئای کە حەمەی بەسزمان لە دۆزەخا ژیا! ئەشەوی شەو بوو نەڕۆژی ڕۆژ. خوای ئەوەی بوو لە پەنایەکەوە چاوی بە نازدار بکەوێت. هەندێ جار بە خەیاڵ یان لە خەویا ئەیبینی نازداری مارەکردووە خانوویەکی خۆشیان لە ناوباخا دروست کردووە، بەم ڕۆژگارە "فرمان" ئەکات لەڕێی چاوەگەشە جوانەکانی نازداری نازدارا. بەڕاستی نازدار نازداربوو چونکە ئاغا لە ناو شەش کوڕوسێ ژنا تەنیا یەك کچی هەبوو کچەش بەو هەموو جوانی و سەلاری یە سەلار بوو چونکە لە ماڵی پوری لە شار گەورە بوو بوو هەتا پۆل پێنجەمی خوێندبوو تێکەڵی ئافرەتە خوێنەوارەکان بوو بوو فێری گەلێك شت بو بوو، بە تایبەتی قسەی ئەستەقی پڕ لەحەق. ناو بە ناو کە لە هاوینا ئەهاتەوە بۆ لادێ باوکی زۆری لێ ووردئەبوەوە! لە دواییا بڕیاری دا کە ئیتر خوێندن بەسە! لەو ڕۆژەوە نازدار واپسێی ئاوەتە دووساڵ پەستە، وەکو حەپس و دەست بەسەر وایە! ناهەقی نیە فێری ئەم جۆرە ژیانە نەبووە و زۆریش قینی لەکردارو گفتۆگۆی باوکیەتی بەڵام چی بکا؟! ناو بە ناو تووڕە ئەبوو لە هەندێ شت، هەڵ ئەچوو بەڵام ئاشتیان ئەکردەوە هەندێ جاریش پەتی "ئەریتی" ئەپچڕان بە تاقی تەنیا ئەچووە سەرکانی، ناو باخ بەدزیەوە! بەڵام لەو ڕۆژەوە کەمەسەلەی مارەکە ڕووی دا ئیتر بڕای بڕ بهێڵن بێتەدەرەوە! قەدەغەی لێکرا، پیرێژنی سەرئاسنینی لێ ڕاسپێردرا بەم ڕۆژگارە چاویان لێ نەئەتروکان. لەڕۆژی مەسەلەی مارەوە(حەزی) لەحەمە کردبوو بەڵام حەزلێکردنی بێ قسەکردن پیاو ئەسووتێنێ گوریسی پێ ئەپچڕێنێ، لەبەر ئەوەبوو شەو لە ناکاوێك خۆی دەربازکرد لە ئیشکچی و ملی نا بۆ ماڵی مەجنون.

لە پێشەوە حەمە هەروای ئەزانی لە خەوایە.... بەڵام لە دواییدا تۆزێکی مابوو شێت ببێ... وەك خوشك و برا چەند سەعاتێکی کەم بەیەکەوە بوون بڕیاریان تیادا کە بۆیەك بن. بەڵام دەستی "ڕێکەوت" ئەی هێشت بە ئاوات بگەن، ئەیهێشت تێر جامی "دڵداری" پاك بنۆشن، بە هەموو دڵڕەقیەکەوە پلارێکی تیژی بەگوڕی تێگرتن هەردووکیانی بەسەریەکا ساردکردەوە... تومەز برا گەورەی نازدار کە هەست بەڕۆیشتنی ئەکا دەست ئەداتە تفەنگ ماڵ ئاگادار ئەکا.... ئەیان ووت شەش گوللەی بە هەردووکیانەوە ناوە... هەزار ڕەحمەت بۆ ئەوجووتە دڵدارە، هەزار ئەحلەتیش بۆ ئەو ئەرێت و یاسایانە کە بەربەستی دڵداری ئەکەن! وا ئەوان نێژران، سعیدی ئیشکچی پیاو کوژەکەی کوشتەوە و بوو بەجەردە بەو شاخانەوە.... ماڵ بەرەڵاو منال برسی... ئاغاو ئاغاژنیش کەوتوونەتەوە فرمێسك ڕشتنی پەشیمانی... لەدوای چەند ساڵێك ئەم خەڵقانە تێکڕا هەموویان ئەمرن.... بەڵام چیرۆکی دڵداری ناسۆراوی "ناکام"ی نازدار و حەمە، هەرگیز لە بیرناچێتەوە، هەرگیز لە"یاد" دەرناچێت، هەرگیز نامرێت، چونکە دڵداری خۆی شتێکە(نەمر).

## سەرچاوە

گۆڤاری پەیام ژمارە(258)ئەیلول1954بەرگ(6)لاپەڕە(10-16)

## پەراوێز

ناوی خوازراوی ڕەفیق چالاکە

# گوڵ و دڕك

## پارچەیەك ئەدەبی ڕەمزی

رەفیق چالاك

دەمەو بەیانێك، كە ڕۆژی زەرد هەڵگەڕاو خەریك بو خۆی ڕزگار ئەكرد لەپەتو داوی شەوی تاریك، پێنج سورە گوڵ لە باخێكی خنجیلانەدا خەبەریان بوەوە..... . ئەم پێنج سورە گوڵە دەستیان كرد بەدرەوشانەوە لەژێرتیشكی زەردی ڕۆژی زێرینی دەم كەلا.

هەر گوڵە تاقانەی بنەدار گوڵێكی جیاواز بو.

هەر پێنجیان لە ئاوە پاكە ڕونە مرواریەكەی جۆگەكەی بەردەمیانا چاویان بەخۆیان ئەكەوت كە شەماڵی فێنكی بەیانی شنەشن ئەی لەراندنەوە.

هەموویان لە تۆوێك بون كە باخەوانی ئەزەلی كردویەتی بەم باخەوە.

پێنج خوشكی عازەب بون خۆشی ژیانیان نەچێشتبو، تازە هەر ئەو بەیانی یە لە خەوی سەرسامی هەڵسابون، هەر ئەو دەمەو بەیانە خەریكی پشكوتن بون، لە خۆشی بەزمو ڕەزمی ژیان یەكی فرمێسكێكی ئاورنگی سپی بێگەرد لە چاوەكانیانا قەتیس وەستابو.

خوشكی گەورە ڕوی كردە خوشكەكانی تری و وتی:

ژیان پێنج و دوو ڕۆژێكە، عومر ئەوەندەی بە بەردەوە نییە، تاقە بە هارێكی كورت ئەمان بینێ و لە پاشانا ئەمرین. پێویستە لە سەرمان بیربكەینەوە لەپاشەڕۆژمان، ئێستا هەڕەتی لاویمانە، سەردەمی هەڵسان و خەبەر بونەوەمانە، ئیمڕۆ یەكەمین ڕۆژی بەهارمانە لە پاش زستانێكی تەڕو توشی سەهۆڵ بەندان، لە پاش زستانێكی پڕ تۆفو ڕەشەباو باران، پڕ بەفر و زوقمو زەلالەت، پێویستە هەریەكەمان ڕێگایەك بدۆزینەوە، من بەش بە حاڵی خۆم وای بە باش ئەزانم كەلە دیلیەتی ئەم باخە ڕزگارم بێت، ئافرەتێكی خوێندەواری تێگەیشتوی ماڵومناڵ بەڕێوەبەر، بمكات بەقژە جوانەكەیا، یان لە ناو گوڵدانێكا دام بنێو ڕوبكاتە مناڵەكانیو پێیان بڵێت:- "داواتان لێ ئەكەم وەكو ئەم گوڵە پاكو خاوێن بن، بۆنو بەرامەتان وەكو بۆنی ئەم، هەموو وڵات بۆنداروكاس بكات...) .

گوڵی دووەم كە پەپولەیەكی سپی جوان لەسەری نوستبو خەوی بەیارەوە ئەبینی، ڕوی كردە خوشكەكانیو وتی: خوشكینە ڕاستتان پێبڵێم من حەز لەوە ئەكەم لاوێكی سەربازی ئازای لەڕێی نیشتمانا خۆبەختكەر بمكات بەیەخەی چاكەتە سەربازیەكەیاو بەسەرما بنەڕێنێ:"ئەی گوڵە سورەكە! شەرتی پیاوەتی بێت، زەوی ئەم وڵاتە جوانە بەخوێنی- دوشمنی ستەمكار سووربكەم وەكو ڕەنگی تۆ."

گوڵی سێیەم سەری بەرزكردەوە و لێوێكی هەڵقرچان و وتی: لە پێش ئەوەدا بەهار كۆچ بكات و بمرم، تاقە هیوام ئەوەیە لە ژیانا: خاوەن گۆڤارێك، شاعرێك، یان نوسەرێك، تێر تەماشام بكات، چاك لێم وورد ببێتەوە، لەبەر دەمی خۆیا دامبنێ و بەم چەند ووشەیە لە ناو كاغەز و كتێبا ناووم بە(نەمری) بهێڵێتەوە:" ئەی گوڵ! یاری بولبول، خشڵی شایی و زەماوەندی كچە جوانە هەژارەكان، بۆن و بەرامەی تۆیە ئەبێ بە ئاگرخۆشكەری دڵداری، تۆی ئەی گوڵ! بووكە تاقانەكەی بەهار، تۆی سەرچاوەی ئیلهامی فەن و شیعر و نووسین، تۆی بە خوێنی گەشی شەهیدەكانی ئەم وڵاتە ڕەنگی سوورت پۆشیوە، مێخەك و سمڵی دایك و خوشكی ئەو شەهیدانە بۆنداریان كردوی، فرمێسكی جەرگ بڕاوان و ڕۆڵە كوژراوانی نیشتمان ئاویان داوی.... ".

گوڵی چوارەم كە هەنگێكی زەرد باوی بچوك بە ویزەویز خەریك بو دڵداری خۆی تێ بگەێنێ بە دەنگێكی بەرز وتی: تكاتان لێ ئەكەم هەموتان بێ دەنگبن، هیچتان ڕێیەكی باشتان نەدۆزیوەتەوە من دڵنیاكات لەبەر ئەوە وامن بیرو باوەڕی تایبەتی خۆم دەرئەبڕم: ئەو حەڵە خۆم بە بەختیار ئەزانم سەرداری سیاسی ڕاست و ڕەوان بمگرێ بە دەستیەوە لە ناو كۆمەڵێكی سیاسی گەورەدا كە هەموو بۆ ئازادی نیشتمان كۆ بونەتەوە بڵێت:"ئەی لاوان و پیاوانی ئەم وڵاتە! ئەی ئەو كەسانەی خەریكن ئەتەوەیەكی پچڕپچڕ ئەنەنەوە دەم یەك، ئەی ئەوانەی مقدراتی ئەم نەتەوەیەتان وا بەسەرشانەوە، دایكی نیشتمان داواتان لێ ئەكات، كاروبار بە هەڵەشەیی نەكەن، خۆویست نەبن، بەدڵسۆزی كاربكەن، یەك بگرن و هەرگیز دەستی یەكتری بەرەڵامەكەن، بڕواننە ئەم گوڵەی دەستم ئەگەر هاتو هەڵمان پچورقان هەرچی جوانی یەكی هەیە، هەرچی ژیانێكی تیایە، نایمێنێ، ئەگەر ئەم گوڵە پەڕە پەڕە بكرێت هەرچی بۆن و بەرامێكی هەیە هەموی با ئەیبات ئێوەش ئەگەریەك نەگرن وەكو گوڵێكی هەڵپچورقاو ئەبن كە پێی لێ ئەنرێ لەسەرە ڕێگادا."

گوڵی پێنجەم هەناسەیەكی هەڵكێشا، ڕویكردە ڕۆژی دەم كەل، دڵۆپێك ئاورنگ لە جیاتی فرمێسك تكایە سەر زەویە سەوزەكەی بەردەمی، بەدەنگێكی ناسك ئەم ووشانەی لەدەم هاتەدەرەوە: خوای گەورە! ئەمەوێ بەهاری ژیانم بۆ درێژبكەیتەوە، لەزەوی وڵاتەكەما بە خۆشی و شادی و ئازادی بژیم، ئەوی من ئازار ئەدات ئەوی ژیانی لە من تاڵكردوە، ئەم دڕكانەیە كە هاتونەتە تەنیشتم نایەڵن ساتێ ئاسودەبم.

خوایە! دڕكم لێ دووربخەرەوەو عمرێكی زۆری لەگەڵا ژیام، تاقیم كردەوە، زانیم كە هەرگیز ناتوانم لە گەڵیا بژیم، هەرگیز حەز ناكەم لە زەوی گوڵانا ببیبنم.

خوایە! تو ئەم دەمەو بەیانە لە هەواو ئاوو زەوی و ئاسمانی وڵاتەكەمم مەكە، گوڵێكی بێ دەسەڵاتم ئەمەوێ خێر لە ژیان ببینم، دڕك لێم دووركەرێتەوە. هەتاكەی؟ نەیەڵێت گەشە بكەم لە وڵاتی خۆما لە ژێر تیشكی ڕووناكیا".

هێشتا گوڵی پێنجەم لەداخ بەباكردن و لە مناجات و پاڕانەوە نەبوبۆوە ئافرەتە خوێندەوارەكەی خاوەن ماڵەكە وەكو نەرێتی كۆنیەتی هەمو بەیانیەك گوڵێكی گەورە ئەخاتە ناوگوڵدانی سەرمێزی چا خواردنەوە، هات و گوڵی یەكەمی كردەوە، لە پاش تۆزێك كوڕی گەورەی ئافرەت كە سەربازێكی نیشتمان پەروەر بو لە ماڵ ئەچوە دەرەوە بۆ مەشق كردن لە قشڵە، بەلای گوڵەكانا تێپەڕی، شاڵاوی بۆ گوڵی دووەم برد، وەكو هەڵمەت بباتە سەر دوژمن و وتی: چەند سوورە ئەڵێی خوێنە، كوڕی دووەمی ئافرەت كە نوسەرێكی لاوبو، هەموو بەیانیەك ئەبوایە چاوی تێركردایە لە جوانی كردگار، هاتە ناو باخەكەوە و تێر بە

دەورولانی گوڵی سێیەما هاتو تێر لێی وورد بوەوە و ئینجا پڕ بەدەم هاواری کرد: ئای لەم گوڵە تەلیسماوییە، ئیمرۆ ئەیکەم بە مەقالەیەك... مێردی ئافرەتەیش کە سەردارێکی سیاسی بە ناوبانگبو، لە ژورێکی نزیك باخەکە دانیشتبو ووتارێکی سیاسی ئەنوسی بۆ کۆبونەوەی کۆمەڵی گەورەی نیشتمان بەدەم هاواری کوڕەکەیەوە چوو ئەویش گوڵی چوارەمی بەدڵبوو کردیەوە، لە پاش کەمێك باخەوان هات بۆ بژارو بۆ ئاودان دڕك لە هەموو لایەکەوە چوون بە لەشیاو ئازارێکی زۆریان پێگەیاند، لەبەرئەوە بە پاچە کۆڵەکەی هەموو دڕکو داڵەکانی دەوروپشتی گوڵەکانی لەڕەگ و ڕیشە دەرهێنا.

بەم جۆرە هەمو گوڵەکان بە ئاواتی خۆیان گەیشتن،گوڵی پێنجەم بەهارێکی خۆشی ڕابوارد، تێر خواردەمەنی لە زەوی یەکەی خۆی چنگکەوت، تێری لە تیشکی ڕووناکیخوارد، ئینجا ووشکبو، وەری، کەوتە زەوی،سەرلەنوێ لە بەهارا گولێکی سوری جوان لە دایك بوەوە بۆ ئەوەی بە خۆشیو بەختیاری، بەبێ دڕك بژی لەژێرتیشکی ڕووناکیا، لەزەوی نیشتمانی خۆشەویستا.....

گۆڤاری گەلاوێژ- ژمارە(2) ساڵی(5)شوباتی1944 لاپەرشە(9-15)





هەزارەها بیروباوەڕ، گەلێ ڕێگاو شوێنی کۆن و نوێ، هەندێ دەردوبەیّو کوێرەوەری و ناسۆری ژیان ئەیان هێناو ئەیان برد، گوریس پچڕێنەیان پێ ئەکرد، تۆف و گەرداوی خەیاڵی پڕ لە تاپوو تارمایی دەرونیان پڕکردبوو، گیانیان دابوە بەرقامچی، بەرقامچی واقعی ڕەشی تاریکی سامدار، لە تاو وەیشومەی ئەم دەردی سەریانەو، لە تاو بیرەوەری پڕوچڕی ڕۆژانی ژیانی ڕابوردوی دڵیشی کاژەڵەی سەری وەختەبو لە ژێر ئەو تینە بەهێز و پەلامارە یەك لەدوای یەکە پەی دەرپەیانەدا لەلەشی جیا ببێتەوە و خۆی پێوەبەند نەکات.... ئارام و ئۆقرەی لەبەر بڕابوو، جێی بەخۆی نەئەگرت لە هیچ شوێنێکا، کەف و کوڵی هێزی ناو دەرون پاڵیان پێوەئەنا، بەبێ ئەوەی هەست بکات گۆشەگیری بەجێ هێشت، لە کتێبەکانی دورکەوتەوە، کاتێکی زانی خۆی فڕێ داوەتە باوەش کۆمەڵ.. دەستیکرد بەگەڕان بە شوێن دەرمانا، دەرمانی دڵ، دەرمانێ کەف و کوڵی دەرون.. بۆ تۆزێ بەفر ئەگەڕا، ئەو دڵ و دەرونە ئاگر تێ بەربوە هەڵقرچاوە پڕ جۆش و خرۆشەی پێ فێنك بکاتەوە.... بۆ تۆزێك بەفر ئەگەڕا بەڵام... کوا بەفر؟! بەفر لە ناو ئەم کۆمەڵەدا درۆیە هەرگیز لەم چلەی هاوینەدا دەست ناکەوێت زۆرگەڕا، زۆری لە خەڵق پرسی: تۆزێ بەفر! ئێستاو ئەوسا دەستی نەکەوت، بە نائومێدی کۆمەڵ و ژیانی کۆمەڵایەتی بەجێ هێشت، ئەفرینی لە نەریتی ڕابوردو کرد، خۆی ئازادکرد لە درۆ و دەلەسەو ڕیایی و فیشاڵ و قسەی زلی بێ کەڵکی بێ سەمەرەی ئەم وئەو،نظریاتی بێ قازانجی ڕاوەدونا، لە هەمووشتێك بورد لە تەقەلاو تێکۆشین و ڕەنج نەبێ، گوێی نەدایە کەس، گوێی نەدایە بەرهەڵستی، ئازایەتیەکی بەتینی نەدەبی نواندو هەوڵی داو تێکۆشاو نیشیکرد، بەڵام بەفر هەر نەبوو.. لە هەموولایەکەوە سەری دنیای لێهاتەوە یەك.. بەشێکی زۆری کۆمەڵی دوو ڕووی نیسکی بێ بەروپشت، کۆمەڵ بەخزم و کەسوکار و بەدور ونزیکەوە، بەناسیاوو نەناسیاوەوە لێی هەڵسانە سەرپێ وەکو نەریتیانە.. کەوتە گێژەوە، کەوتە بەر قینی

شەپۆل... شەپۆلی زۆر سەخت چەند جارێ دایان بە کەناری سەختی پەقەنا... هەموو لەشی سەرتاپا زامارو خوێناوی بوو، شڕەی بەبەرەوە نەما، بەڵام هەر خۆی گرت، هەر بۆ بەفر گەڕا.....

پڕ بەدەم هاواری بەفری ئەکرد کە بە دەرمانی ئەم و دەرمانی هەموو ئادەمیزادێکی وەکو خۆی ئەزانی، بەڵام کێ گوێی لێ ئەگرێ؟ کێ یارمەتی ئەدا؟.... . دەلەم تۆف و گەرداوەدا، لەم ناخۆشی و تاڵی وتاریکیەدا، لەم بارکەوتوییەدا، لەم بێ هیواییەدا دەستێکی پڕ خۆشەویستی و پڕ وەفا، دەستێکی پڕ ئەفسون و جادو، دەستی پەرییەکی گیان بەرزی بۆ درێژبوو دەستیگرت بەڕووناکی چاوە جوانەکانی شەوە زەنگی بۆ ڕۆشن کردەوە، بەدەنگە مۆسیقاییەکەی ئارام و ئۆقرەی بۆ بانگ کردەوە، بەو پەنجە ناسکە شیرینانەی دەرمانی برینەکانی کرد... لەناو جەرگەی تۆف و گەرداوی پڕسام و ترسەوە لە ناو باوەشی ئەو شەپۆلە زراو بەرانەوە دەری هێناو لە کەناری بێ ترسا دایناو، بە کورتی لە گیانەڵاوە ژیاندیەوە، لە زەبوونیەوە هێزوگوڕێکی تازەو، لە بێ هیواییەوە هیوایەکی زۆری سەرلەنوێ کردەوە بەبەرا، دە ئەم پارچەیە پێشکەشی ئەوە هی کەسی ترنا چونکە نیگای ئەوە.

(1)

لە کاتی وڕێنەکردنی پاش گرانەتۆی ئەفرین کردنم لە نەریتی کۆن و کۆنەپەرست کە زنجیری دیلی عورف و عادەتی کۆنی کۆمەڵایەتیم پچڕان کە هەمو کۆمەڵ وە بە تایبەتی هاوجنسەکانت لێم هەڵسانە سەرپێ و گەزارەیان لێ دەرکێشام، کە بۆ تۆزێ بەفر تەقەلام ئەدا و ئەگەڕام، ئەڵێم ئا لەو کاتەدا گیانە شیرینەکەم بریسك و هووری چاوە جوانە پڕ لە خۆشەویستی و وەفاکەتم بۆ دەرکەوت، لە نەخۆشی سەخت و لە خەم و خەفەت و لە بارکەوتویی رزگاری کردم و هەڵیساندمەوە و ڕێگای بۆ ڕووناك کردمەوە.

(2)

تۆف و گەرداوو وەیشومەی بیرو خەیاڵم ئارام و ئۆقرەیان لەبەر بریبوم، هێزی گێتی خواروی پیسی ناپاکی کۆن بەزۆر بەرەو خۆی ڕای ئەکێشام بۆ ئەوەی بەختمکات لەڕێی ئامانجی ڕەشیا، بمبەستێتەوە، بمکات بە کۆیلەو دیلی(عەیبە)! ئەڵێم ئا لەو کاتە تەنگ و چەڵەمەیەدا زەردەخەنەی لێوە ئاڵەکەی(تۆ)سەرلەنوێ لە دەست ئەو هێزەی سەندمەوە و بە شەرابە ڕەنگ سوورە خوێنینیەکەی سەرخۆشی کردم، مەست بووم، پڕبەدڵ، بەقاقا دەستمکرد بە پێکەنین، بە گاڵتەپێکردنی دۆستە دوژمنەکانم.....

(3)

وێڵ و پەتیارەبووم، ئارام و ئۆقرەم لەبەربڕابوو، سەرم نابو ئەڕۆیشتم نەم ئەزانی بۆکوێ، سەرێك و هەزار سەودا، لاشە یەك و هەزار دەرد و کوێرەوەری، ئەهاتم و ئەچوم هەر لە خۆمەوە ملم ئەنا هەر ئەرۆیشتم بەرەو تاریکی، بەرەو نەزانین، بەرەو بێهیوایی، بەرەو دیلی، بەرەومردن، بەرەو هەمووشتێك، دەئالەو کاتەدا دەست لەمل کردنە گەرم و گوڕەکەی(تۆ) بەستمیەوە و لە خراپە دووری خستمەوە، چاوی دۆستە دوژمنەکانمت بەم جۆرە ڕەنگینە بە نرخ نەکڕاوە بێنێش و ئازارە بۆ کوێرکردم...

(4)

قینم هەڵسابوو لە کۆمەڵ و لەوانەی ئەم کۆمەڵەیان بەم دەردەبردوەو کە هەزارانی وەکو منیان بەگورگان خوارد و داوەو کتێب، قانون، شریعەت، وەفا، دڵسۆزی، ڕاستی.... پێکەنینم پیان ئەهات، زەردەخەنەی پڕ ئاسۆریان پێ دروست ئەکردم، ئەفرینم لە خزم و کەس و کار ئەکرد، ئافرەتم تێکڕا لە لا بوبوو بە دەعباو جڕوجانەوەر، بە جڕوجانەوەری نینۆك تیژی دەم خوێناوی ڕووجوانی پڕفێڵ و مەکر... دە(تۆ) تۆی خۆشەویست بەو دەنگە مۆسیقاییەت بەو بیرو باوەڕە بەرزەت، منت هێنایەوە سەر ڕێ، ڕاستی پڕ ئێش و ئازاری هەموشتێکت تێ گەیاندم و دڵنیات کردم.....

(5)

زۆر ساویلکەبووم.... وام ئەزانی دەرمانی ئاگر بەفرە... هەموو کەل و قوژبنێك گەڕام بە شوێن بەفرا... هەموو کەموکوڕیەکم لەڕێی پارچەیەك بەفرا قبوڵ ئەکرد، هەزارەها جار ئەپاڕامەوە و ئەلالامەوە بۆ تۆزێ بەفر کە گڕی دەرونی ئاگر تێبەربوومی پێ بکوژێنمەوە.... (پانزە) ساڵ؟! بەڵێ پانزە ساڵ گەڕام، تێکەڵاوی هەموو چینێك بووم، گەڵ وڵاتم دی، زۆرم خوێندەوە، زۆرم خۆخەڵەتان، سەرم کرد بە کۆشی هەزار کەسا، پڕبەدەم هاوارم ئەکرد دەرمان! تۆزێ بەفرا . ئەوانەی خۆیان بە دڵسۆزم دا ئەنا، کە خۆیان بەوەفا ئەدایە قەڵەم کەسیان تیماریان نەکردم، کەسیان ڕێگایان بۆ نەدۆزیمەوە، گەڕامەوە لە گەشتەکانم، گەڕامەوە لە بیروباوەڕەکانم بە دڵ شکاوی و بەڕەنجەڕۆیی، دە (تۆ) تۆی بە وەفای دڵسۆز، لە پاش ئەم پانزەساڵە دڵ و دەرونت، نهادی بەرز و پاکت، ڕاستی بیروباوەڕت، تۆیان سەرلەنوێ لە من نزیك کردەوە بە عەتری ماچەکانت بڵێسەی ئاگری گیان و دەرون و کەللەمت زیاتر خۆشکردو تێت گەیاندم کە دەرمانی ئاگر (ئاگرە) نەك بەفر!.

(6)

ئێستا ڕوەو ئاگر ئەڕۆم، ئەچمە ناو ئاگرەوە و ئاگرم ئەوێت! ئاگرێك سەرتاپا شەوەزەنگی ناشیرین ڕووناك بکاتەوە و هەمووشتێك بسوتێنێت! نەریت، ڕابوردو، یاسای کۆن و کۆنەپەرست، هەموو شتێك نەمێنێت، ئەوسا سەر لە نوێ ژیانێکی لە ئاگر پەیابوو بێنینەکایەوە هەموو ئادەمیزادێك بە خۆشی بژی و ئازادبێ، هەموو نەتەوەیەك سەربەست و بەختیاربێ....

(7)

لە کاتی پەستی و دڵتەنگیا، لە کاتی ئێش و ئازار و کوێرەوەریا.... هەنگاو بە هەنگاو، بە بازدان یان بە ڕاکردن هەرشوێنت ئەکەوم... هەر دێم بە دووتا هەرگیز وازت لێناهێنم.... باترس و سام هەموو دنیا داگیربکەن.... با ڕێگاو بان هەمووی کەندر کۆسپ و چاڵ و چۆڵ وپڕ دڕك و داڵ و پڕ دەعباو جانەوەر بێ، باقوڵ و قاچم شەقار شەقار بێت، بە چنگەڕنێ، لەسەر سنگ هەردێم بەشوێنتا، وازت لێ ناهێنم، لە کۆڵت نابمەوە... پێیەکەو ئاوەمە لە جەرگم، ژیانێکە وخستومەتە سەر لەپی دەستم، هاتوم و هەریەم تا بەیەك ئەگەین، تا بۆیەك ئەبین، تا تێر لە ژێر سێبەرتا ئەحەسێمەوە یان ئەمرم.

# هەمیشە وای لە دڵما

ڕەفیق چالاك



"گیانە شیرینەکەم! لێم ببورە کە ناتوانم لەمە زیاتر خۆم بخۆمەوە و چارم ناچارە گۆڕی یادگار هەڵئەتەکێنم و سەر لە نوێ بیرەوەری پاکی ساکاری پڕ لە ئەفسونی جوانی سەرەتای لاوی چەند ساڵ لەمەوبەر کە بوە بە مێژوو زیندو ئەکەمەوە چونکە ناتوانم و بەبێ وەفایی دائەنێم لەبیرخۆمت ببەمەوە، ئەوەش بزانە کـــــە هیچ هیوایەکم پێت نەماوە و هەتا شۆریش ئەکرێمە ناو گۆڕ، تۆی خۆشەویستی خۆشترین ڕۆژانی تەمەنم هەروای لە دڵما، هەمیشەوای لەدڵما!"

(1)

هەردوکمان بەیەکەوە و بۆ یەك دڵمان کرایەوە، هەردووکمان سەرەتای بەهاری ژیانی دڵداریمان بو، نە ئەو دڵی لە پێش منا بۆ یەکێکی تر کرابوەوە و نە منیش ئەمزانی دڵداری چی‌یە؟ پێش ئەم یەکتری ناسینەو بەر لەم دڵداریە ژیانێکی منالانەمان ڕائەبوارد، چەپمان لە کۆترو مراوی ناوماڵ ئەگەڕابوەوە ئەوەندە ساکار بوین، هێشتا ئەمان ئەزانی هەستی ڕاستەقینەو جۆشی پڕ وەیشومەو ژیانی تەوارچی‌یە!

چەند شیرین و سیحراوی و چەند پاکو پیرۆزو چەند پڕجۆش و خرۆش و کەڵك بەخشبو دڵداری ڕاستی یەکەمجار! واسەر لە نوێ ناخی جوڵاندمەوە و خستمیەوە بەیایی، خۆزگە جارێکی کە ئەمدییەوە و ئەگەڕێنرامەوە بۆ سەرەتای ئەوڕێیەی پیایا ڕۆیشتم... بەڵام داخی گرانم ئەوی کە تێپەڕی ئەچێتە خانەی ڕابوردوەوە و لە ناخا جێی خۆی ئەگرێ و ئەبێ بە یادگار، بەمێژوو!

لاپەڕەیەکی پڕ لە ناخۆشی گیانە بە هەزار لاپەڕەی شادی، لاپەڕەیەکی ڕەش بەسەد هەزاران لاپەڕەی سپی و سوری خوێنین پاك و جوان نابێتەوە و ناڕازێتەوە و لە یاد ناچێتەوە! هەزار خۆزگە هیچ ناهێنێت! جگە لەوەش وامن هەمو قۆناغەکانی ڕێگەی دووردرێژی ژیانی پڕ لە مەینەتیم بڕیوە، لەناو ئەشکەوت و شاخ و دۆڵ و دەرە سەیرەکانیا وێڵ و ئاوارە و ون بوم! بەتاسەیەکی پڕداخـــەوە

رابوردوی پڕوچڕی ڕۆژانی پڕ لە خۆشەویستیو شکۆی جارانم لە دڵەی پڕ ئازاری خۆما بنێژم بە ساواییو بە ناکامی، فرمێسکی خوێنینیان لە دوا بڕێژم، ئەشکەنجەو ئازاریان لە بۆ بچێژم بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی ناو ئەم دنیایە سەبوریم بدا، بەبێ ئەوەی هیچ بە فراوو بەستەڵەکێکی ئەم کائیناتە کڵپەی ناو دەرونی گڕتێبەربوم دابمرکێنێتەوە، هیچ کەسێك نەبوە ویژدانی کۆرپەی لە تەنگانەدا تاساوم بلاوێنێتەوە!

(2)

لە تافی لاویمانا توشی یەك بوین... دەست بەجێ گیانی هەردووکمان بون بەیەك و خوشك وبرای ئەزەلی یەکتریان دۆزییەوە و لە تاقە ئانێکا، لەچاوتروکانێکا بڕیاری تەواویاندا کە هەرگیز لەیەك جیانەبنەوە.

هەردوکمان لەیەك تەمەن و لەیەك پلەی زانستابوین، هەتا بڵێی یەکتریمان خۆش ئەویست، گوایە بۆ وا نەبین؟!

لە نەتەوەیەك بوین و لە شارێکا دائەنیشتین و بەزمانێك قسەمان ئەکرد، بەڵام داخی داخانم ئەوە هەر لە سەرەتاوە ترسی نابومەبەر(ئەو) دەوڵەمەندو(من) هەژار، ئەو ناسراوو من بێ ناوبوم! لەگەڵ ئەمەشدا وەکو چنارو لاولاو لەیەك ئالابوین کە لە پڕ دەستی ڕێبوارێکی دڵڕەقی نیمچەشێت لەیەکی کردین، هەردوکمان ئەموستیلەو نقێمێکی جوانی رەنگین بوین ئەدرەوشاینەوە بەڵام دەستی ناشییەکی بایی بە دەسەڵات لەیەکی جیاکردینەوە ئەوی خستەناو کورەی ئاگرو منی فڕێدایە ناو دەریایەکی ئێجگار قوڵی سامناك...

(3)

ماوەی چوار ساڵێك بەیەکەوە بوین، ئەمن دڵم لەو پەشاو ئەئەو ڕۆژێك لە من ڕەنجا، کە بەیەك ئەگەیشتین لە ڕێی قوتابخانەو ماڵەوە و سەیران یان ڕۆژانی هەینی لەگردی سەیوان، لە سەرقەبران کە پڕیەتی لەلاشەی بێکیان، لەکەسوکارە کۆست کەوتوەکان، کە ئەبێتە ڕۆژی مەحشەر جومعان سەر لە بەیانیان لەبەر لاوانەوەو شین و گریان ئەڵێم کە بەیەك ئەگەیشتین و دەرفەتێکمان دەست ئەکەوت فریشتەکانی ئاسمانیش خۆزگەیان پێ ئەبردین و قەست بو یەکتری قوت بدەین! بڕوامان نەئەکرد، بەڵکو بەبیرمانا گوزەری نەئەکرد، یان بە تاوانمان ئەزانی بیر لەوە بکەینەوە کە بۆ یەکتری نابین یان لەیەك ئەکرێین! هەموو کاتێکی ژیانمان پڕ بو لە شادی و هیوار گەشکەو پێکەنین، پەیتا پەیتا تەزوی کامەرانی بە ئامباڵای لە شمانا ئەهات و ئەچو ئەوەندە لە خۆمان بایی بوین وامان ئەزانی جڵەوی گالیسکەی ژیان وا بە دەست خۆمانەوە و بۆ کوێی بناژوێین ئەمانبات... لە تافی لاویمانا بوین هێشتا کوێرەوەری ژیان قاڵی نەکردبوین، هیچ کۆستێکمان لێ نەکەوتبو، هیچ بەر هەڵستیکمان نەهاتبوەرێ، ئەمان ئەزانی لە فەرهەنگی زمانا وشەی ئەشکەنجە و ئازار وداخ بەچی ئەوترێ! هێشتا خاوبوین ئەمان ئەزانی ئەبێ تەشی ژیان بامان بدات! ئەوەندەم خۆشئەویست بوبوم بە سێبەری و شارە و شارم بە شوێنا ئەکرد، ئەویش ناومی کردبو بەویردی سەر زمانی و کە ئەشی دیم دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکی خۆشەویستی لە چاوە جوانەکانیا دوای کەمێ قەتیسی وەك مرواری ئەکەوتنەخوارێ و زەردەخەنەی شادی لە لێوە ئاڵەکانی ئەفڕی...

(4)

دوو خونچە گوڵ بوین، کەمێکمان مابو بگەشێینەوەو ناوباخی ژیان بۆندارجوان بکەین و بیڕازێنینەوە و فەڕو خێر پەخشکەین... ئەوەندەمان نەمابو لە خەم بڕەخسێین و ژیان پڕتام و چێژ لە سەر زەوی بە هێزی نەبەزی لاوی بهێنینەکایەوە.

لە شانزەی حوزەیرانی چەند ساڵێك لەمەوبەردا دەمەو بەیانێك سەری هەڵبڕی، لە شەبەقەوە تاچێشتەنگاوێکی درەنگ تێر تێی ڕوانیم! ژاکاو، سەرسورماو، ئەبڵەق وەستاو، فرمێسك لە چاو، تێرتێی ڕوانیم، بە زمانێکی لە گۆکەوتوی وەك لاڵی کۆست کەوتو چەند ورتەیەکی کرد، وتم ورتە؟! نەء! ئازاری پەنگ خواردوی ناخی دەرونی خۆی دەرئەبڕی، لەگەڵ هەمو هەناسەیەکیا دڵۆگیان ئەفڕی، دوای سارێژ کردنی ئازار، چارم نەما ئەوەنەبێ کە بەگەرمی باسی ژیانی پاشەڕۆژی بۆ بکەم، لەو ئاواتانە دوام کەوان لە دڵی هەموو لاوێکی پاکی بیربەرزا، لەوهێزە گەورەیە دوام کە پاڵم پێوە ئەنێت بۆتێکۆشان و خەبات، بۆ ڕەنج و تەقەلادان تا ئەکرێمەوە و ئەبم بە گوڵێکی تەواوی بۆنداری جوان لە باخچەی ئەم ژیانە شێواوەدا..

کەمانگی زیوین هەڵات و کردگار خامۆشییەکی سەرنەمی خەڵەتێنەری هێنایە ئاوناوان و سەلماندی بە ئینسانی ساکاری بەسزمان، تێر تەماشای یەکمان کردو چاومان بڕیە چاوی یەك و ئەمان ویست یەکتری دڵنیاکەین لە پاشەڕۆژ، لەوشتانەی وان لە پەردەی هات و نەهاتی ئەزانراوا! بە هیواوە سەرمان نایەوە و لەیەك دابڕاین و ئارامەمان وەك ئۆقرە و ئارامی هەمو کۆستکەوتویەك گینکڵی پێدایین هەتا بەیان..

(5)

هەر بۆ ئەو بەیانییە هاوارێکی جگەربڕ ڕایچڵەکاندمەوە، کە ئەبیتم خونچەی ئامانجم، بەشەکەی کەی گیانم وابە دەم قەڵێکی ڕەزاقورسی دڵ ڕەقەوەیە ئەی ڕفێنێ بۆ دور، بۆ زەوی گەرمیانی چۆڵ و هۆڵی پڕ لە مارو مور، دوری ئەخاتەوە لە کوێستانی کانگای جوانی و نور..

خونچەیەکی ئەکراوەی بێ بۆن و بەرامەو بێ دەسەڵات بوم هیچم لە دەست نەئەهات جگەلەوەی کە خۆم بخۆمەوە و سەری پڕ لە وەیشومەم بنێمەبەر ئەژنۆی لەرزیو، بە خەیاڵ ببمە ڕاوکەر و لە جیاتی جارێ ڕۆژی هەزارجار قەلی دەعبا تیرەبارانکەم!

ڕۆژبەدوای ڕۆژا و ساڵ بەدوای ساڵا تێپەڕین، ڕۆژم بە ساڵ و ساڵم هەرلێ نەئەڕۆیشت، کرامەوە و بوم بەگوڵ، ژاکاو و تاساوو ناکام، هەر ڕۆژە پەڕەیەکم ئەدا بەدەم باوە و تەمەن هەرچەندە بەرەو کاملی ئەچو بەڵام بەرەو نەمانیش. نازانم بۆ مامەوە لەم کۆنە هەوارە بێ مەعنایەدا کەهیچی بەسەر هیچەوە نییە، بەڵام ئەوی یەقین و بێگومان بێت ئەوەیە کە مامەوە بۆ دەست بەدەستادان و کوێرەوەری چێشتن و ناسۆر و کۆست و ئاخ هەڵکێشان و ڕەنج بێ وەری، بۆ خەم خواردن و ئەشکەنجەو بەیایی و بیرەوەری!

(6)

لەدوای پێنج ساڵ وەیشومەی ناو دەرون ڕاپێچی کردم بۆ غەریبی و ئاوارەبون، هەتا توانیم دورکەوتمەوە و هەر ڕۆیشتم پشت(لەوو) ڕوو لە نەزانراوی پڕسام، لەکەنار دەریای سپی، لە شارێکی ئێجگار خۆشی جوانا گیرسامەوە وەکو کەشتییەکی سەوڵشکاو، زۆرم ئەویست لە بیرخۆمی بەرمەوە، کەللەی پڕ تاسەم بە شتی تر گەرم بکەم، بەڵام خەیاڵم

خاوبو، دڵەی کۆست کەوتوی بێ عارم بەسەریا ئەنەڕاندم: "هەرگیز دڵداری یەکەمجار لە بیر ناچێتەوە، لە یاد ناچێتەدەر!"

ژورم بەجێ هێشت و لە ناو بەیەکاهاتنی دەرونی و وەیشومەو گەرداوی دەرون نۆقرەم لەبەر بڕا و سەرم هەڵگرت بۆ کەنار زەریا، هێشتا کەللەی داگیرساوم هەر ئەزرنگایەوە کەلە دور، لە ناو جەرگەی شەپۆلەکانا، کەشتییەوانێکی بە ساڵاچو، بەدەنگێکی زوڵاڵی کاریگەرەوە لەسەر ئاوازێکی ئێجگار بە جۆش ئەم گۆرانییەی ئەوت:- هەرگیز لە بیرم ناچیت، هەمیشە وای لە دڵما تۆفوکەرداوی توندو تیژ شاخ هەڵتەکێنێت گردۆڵکەو جەنگەڵی چڕ لە بنەڕەت دەربهێنێت سەرتاپا هەمو کردگار بەسەر یەکا بڕوخێنێت

تۆ هەرگیز لەبیرم ناچیت، هەمیشەوای لە دڵما
باوك لە رۆڵەی دڵگیر بێ وبێزار
پەپولە بتورێ لە باخ و گوڵزار
کانی ئاوی خۆی لە دەریا ببڕێت
گەڵاو گۆپکەی دار هەڵوەرێ بمرێت
دوربیت لێم یان نزیك بیت
بتەوێم یان لێم زیز بیت
یاساو نەریتی خواوەند و بەشەر
فریشتە و شەیتان جڕو جانەوەر
(مارس)ە پیسەکەی سەرتاپا هەر شەڕ
هەمو هێزێکی تاریکی بێ فەڕ
پڕچەك بۆ فەوتان هەڵسنەسەرپێ
خاپورکەن دنیا هەر لە شار تا دێ
لەبیرم ناچیت وەرە لە گەڵما
چونکە هەمیشە هەر وای لە دڵما
ئەی پەری، بڕوام ئەوەند بەتینە
پاکی نافەوتێ لەم سەر زەمینە
ناوی نامێنێ دەعباو جانەوەر
هەتا ئەگاتە مارسی خواکەی شەڕ
نە هێزدار ئەبێ و نەچەوتی و نەقین
تام و هیوای جوان ئەکەوێتە ژین
هەمومان تێکڕا ئاسودە ئەبین
بەدەست خۆم نی‌یە وەرە لەگەڵما
چونکە هەمیشە هەروای لە دڵما

(8)

رۆژی زەرد هەڵگەڕاوی زەریا کەمێکی بە دەرەوەمابو، نوقوم بو، ناڵەی پیری پڕ تەنسیری کەشتیەوانیش دورکەوتەوە و لەگوێم ونبو، دنیا تاریك داهات، منیش ئاوارە و غەریب ومات، بڕیارمدا بگەڕێمەوە وڵات، روبکەمەوە رۆژهەڵات، هێشتا شڵپەی ماچی شەپۆل و کەنار هەر لە گوێما بو کەلەبەر خۆمەوە ئەموت:- "باهەمو هیوایەکم لێت ببڕێت، بامۆمی داگیرساوی ژیانیشم کە بۆ



# مستێك خۆڵ

رەفیق چالاك

**پێشكەشی نیشتمان پەرستەكانمان بێت**



چەند ساڵێك لەمەوبەر كە خۆی ناسی لەبەر دەمی پارچە زەویەكی شین هەڵگەڕاوی كوردوستانا ڕاوەستا، سەری شۆڕكرد، نوشتایەوە بۆ ئەو گڵە وەكو هێزێكی نهێنی نەبینراوی گیانی ڕای كێشێ، دەستی لەرزیوی بۆ درێژكرد، مستی لێ پڕكرد، لە لووتی نزیك كردەوە و بۆنی‌كرد، چە بۆنێكی خۆش بوو مەستی كرد؟! چە عەترێكی تەلیسماویە ژیانێكی نوێی لەو ڕۆژەوە كردوە بەبەرا؟! چە بۆنێكە لەم مستەخۆڵە شین دا گەڕاوەدا؟! بۆنی مستێك خۆڵ بۆچی لە تەوقی سەری تا كەڵەموستی پێی هێنایە لەرزین؟! چ جادویەكە موی ئەندامی لاوە هێمنەكەی وەكو باسقەنە ڕاست كردۆتەوە؟! بۆ گڕی ئاگر لە چاوەشینەكانیا دائەگیرسێت؟! چ بەیەكا هاتنێكی سەختی توندو تیژی دەرونیە وای لێكردوە لەوانەیە جلوبەرگ بدڕێنێ و بداتە كێوان؟!.

لە پاش تەماشا كردنی لاپەڕەكانی مێژووی نیشتمانەكەی، لە پاش گەڕانەوە بۆ ڕابوردوی دوورو نزیكی بە خوێن سوركراوی بە فرمێسك ئاودراو، ڕاستی بێ پێچوپەنای بۆ دەركەوت، خۆی دەستی كرد بەوەرام دانەوەی خۆی:-"ئەم مستەخۆڵە خوێن و گیان و ئێسقانی كوردە! هەر ئەم خۆڵە لاوە دلاوەرەكانی بابان و سۆران و دوانزەسوارەی مەریوانە!

ئەم مستەخۆڵە میراتی باپیرەگەورەی صلاح الدینی ئەیوبیو، شێخ سعید و دكتۆر فوئادە!"، دڵ باری خەم و خەفەتی لێ نیشت، لێو زەردەخەنەی لێ دوور كەوتەوە، دەم و چاو گرژهەڵگەڕا، فرمێسك سەری كرد بۆ ئیمڕۆی كورد، زۆری نەخایاند مستە خۆڵەكەی ماچ كردو زەردە خەنەیەكی پڕمیوا هاتە سەرلێوی، سوێندی بە مستەخۆڵ خوارد كە تا دوا هەناسە خزمەتی نیشتمان بكات بەڕاستی، كەمێك مات بوو ئینجا ئەم پرسیارەی لە خۆی كرد:" ئایا لاوانی ئیمڕۆ ئەتوانن ئەم خوێن و ئێسقانانە كـــــــە بوون بە خۆڵ و شین هەڵگەڕاون كۆبكەنەوە و گیانێكی نوێی پڕشكۆو پڕشەرەف و پڕ ئازادی یان بەبەرا بكەنەوە؟!"، هەموو ئەندامی هاتە لەرزین، هەردووچاوە پڕ لە ئاگرەكانی ئەیان ڕوانیە شاخە بەرزە قووچەكان كە بەڵگەن بۆ بەرزی پەروەری نەتەوەكەی، بەبێ ئەوەی هەست بە خۆی بكات تا ئەهات زیاتر مستەخۆڵی لە ناو دەستیا ئەگوشی، لەپڕكرمانی و شاخ و زەوی دەنگیان دایەوە:" بەڵێ! بەڵێ! بەیەك گرتن و بە یارمەتی دانی یەكتری، بەتەقەلادان و بەكـــــــاركردنی ڕاستی، بەخۆبەخت كردن، بەزانست، بەعیبرەت وەرگرتن لە ڕابووردوو، بەهەندێك خوێنی سوور"، لێرەدا وەستاو خۆی بە خۆی ووت: بەخوێنی سوور! بۆچی بە خوێنی سوور؟ چونكە ئەگـــــــەر ئازادی بە هیچ شتێك نەكڕا، وە هیچ شتێك كەڵكی نەبوو، خوێنی سوورە ئەو حەلە نرخی پڕ بە پێستی، ئینجا لەسەر قسەكردنی خۆی ڕۆیشتو ووتی" با ئادەمیزاد حەز لە هەموو جۆرە جوانیەك بكات و، با كڕنوش بۆ گەلێك مەبدەء بیات، بەڵام شەرتی پیاوەتی بێت من هەرگیزاو هەرگیز حەز لە هیچ جـــــۆرە جوانیەك نەكەم ئەو جوانیە نەبێت كە بەمۆری كوردوستان مۆركراوە، كڕنۆش بۆ هیچ جـۆرە مەبدەئێك نەبەم ئەو مبدئە نەبێت كە ئازادكردنی نیشتمانی ئەوێت، ئەم خۆڵەیە ئەو یارەی لەمەبەدواوە بەشەوو بە ڕۆژ هەمیشە خەوی پێوە ئەبینم و بیری لێ ئەكەمـــەوە و خۆمـــی بـــۆ تـــەرخان ئەكـــەم، ڕزگـــاركردن و ئازادكردنی نیشتمانە ئامانج و هیوای ئێجگار بەرز و پیرۆزم.

گۆڤاری گەلاوێژ- ژمارە(9) سالی(5) ئیلولی 1944 لاپەڕە(21-23)

## نموونەی وەرگێڕانی شیعر

# لاوێکی یۆنان

دانەری شاعیری بەرزی فەرەنسە "ڤیکتۆر هۆگۆ"

رەفیق چالاك

گشت نەتەوەیەك شاعیرێکی بەهرەداری هەیە، یەکێ لە شاعیرە بەهرەدارەکانی فرانسە "ڤیکتۆر هۆگۆ"یە، کە بەیاخداری ڕاپەڕینی ئەدەبیە لە چەرخی نۆزدەهەما.

ئەم شاعیرە گەورەیە خاوەنی اسلوبێکی بەرزو بەیانێکی پاراوو الهامێکی سحراویە خۆی ئەترنجێنێتە ناو دەرونی خوێندەوارەوە بە چەند وێنەیەکی خەیاڵی جوان، گێتی‌یەکی پڕ لە جوانیو خەو بینێ دروست ئەکات کە پڕە لە بێ دەنگی و بێ چرپەیی، چەکاتێ خوێندەوار بەم گێتیە پڕناشتیو خۆشیە ڕاهات ئەو حەلە ئەچێتە ناو دڵیەوە بۆ ئەوەی پڕیکات لە شۆڕش و بەیەکاهاتنی عاتیفە، بۆ ئەوەی لە پڕ بناغەی هەستی بلەرزێنێ وەکو ئەو گێتیە پڕ چێژە سەرەتایەك بوبێ بۆ ئەم تۆفو بۆرانە تونو تیژو سەختە...

ئینجا خوێندەوار کەمێ لەم هەستیە خۆشەدا ئەمێنێتەوە و کەمێ ئەکەوێتە ئەو هەستیە سەختو تونوتیژە، بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ گەڵێ موچرکەو تەزوی سەیر سەیر بەدڵیایەت، نازانێ: سەرچاوەی ئەم موچڕکەو تەزوانە لە جوانی فەنەوەیە یا لە هەستێکی پڕ سیحری خۆشەوەیە؟ ئەم قصیدەیەی خوارەوە پارچەیەکە لەو شتەجوانانەی "ڤیکتۆرهۆگۆ" کە ناوی "لاوی یۆنانە" واکردمان بە کوردی هەرچەنە گۆڕینی پارچەیەکی ئەدەبی لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر گەڵێ لە جوانیو لە تایبەتیە فنیەکانی ئەگۆڕێ:-

سپاو لە شکری دوژمن کشایە ناو وولاتەکەیەوە کردی بە دۆزەخێکی بلێسەدار... لولەی تۆپەکانیان ئاڕاستەکردن کردنیان بە کەلاوەی ڕەش هەڵگەڕاو...

لەو هەموو خۆشی و جوانیە ئەم کەساسی وتاڵی و ناشیرینییە پاشەکەوت بوو، لەو ژیانە پڕ هاتو چۆو جوڵانە خامۆشی و بێ دەنگیەکی پڕ ترسو سامدار هاتەکایەوە.

ئەی ئەو لالەزارە جوانانە؟ ئەو کۆشکوتەلارانە؟

نای... ! بوون بە کەلاوەی ڕوخاو، بوون بە شانۆی کونەبەبوو، بە هێلانەی شەمشەمەکوێرە... بە شەوانی تاریك و نوتەك تاق تاق کەرە سەری لێ ئەدەن، بەو نەغمە پڕ ئازارەیانەوە تا بەری بەیان تاق تاقی لەسەر ئەڵێن.

لەو کاتەدا کە ڕۆژ خۆی دا هێڵایە پشت ئاسۆوە ئەو ناوە زۆر کشومات بوو... شارەکە پیاوی ئازاو نەترسی ئەمێنایە لەرزو چۆقە چۆق بە خانوە ڕوخاوەکانی، بە قوژبنە تاریکەکانی، بە کەللەسەری لاکە کەوتوەکانەوە کە گیانیان لە ئاسمانی پانا وێڵ و سەرگەردان بون... لە ناو ئەم کشوماتیە سامدارەدا، لەسەر گردێك کە بەسەر شارەکەدا ئەیڕوانی، لەژێرپیرەدار بەڕوویەکی گەنەڵا لاوێك وەستابو کە لە تەمەنی دەساڵانا بو بە ئێسکێکی سوکو ناوچەوانێکی پاکەوە کە وەکو ئاسمانی بەهار هەموو شینایی یەکەی خۆی کردبێتە جوتە چاوە جوانەکانیەوە... وەکو ئەو ڕۆژەی ئاوابو هەندێ لە تیشکەکانی هێشتا بەسەر قژە زەردەکەیەوە مابێتەوە...

کێیە دایکی؟ کوانێ باوکی؟ کوا یاری و پێکەنینی؟

کوانێ ئەو خۆشیەی کانگای ڕووناکیە لەم گێتییەدا؟ کوان ئەمانە چییان لێ هات؟

وەکو بارانی بەهار فرمێسك لە چاوەکانی ئەباری... هەموو لەشی هاتۆتە لەرزین بەدەم موچڕکەوە...

واشەو بەباڵە ڕەشەکانیەوە هاتە خوارێ بەسەر ئەو کەلاوە خاپورکراوە چۆڵو هۆڵانەدا، لە پاش تۆزێکی کەم ئێرە ئەبێ بە شانۆی گیانانی وێڵو سەرگەردان، لە دوای نەختێکی تر بە هەزاران تارمایی پڕ ترسو سامدار لەم جێیەوە بەرزئەبێتەوە، ئەو تارماییە کێیە؟ کە لە بەردەمی منالەکەدا وەستاوە بەدەم لاواندنەوە وە ئەم پرسیارانەی لێ ئەکات:-

"ئەی ئاوارەی وێڵ! چیتە بۆ سام دایگرتوی؟!

ئایا چۆلەکە باڵ ئاڵتونیەکەت ڕفیوە وا بۆی ئەگریت؟

یان پەپولە سیحراویەکەت لە دەستت بەرەڵا بوە وا ئەم فرمێسکانەی بۆ ئەڕژێنی؟

یان نە ئەمەو نە ئەو، چەپکێ گوڵە باغت ئەوێ دایکت پێشکەشتی بکات لەگەڵ ماچێك و یەك دووقسەی خۆشا؟

مەترسە! پێم بڵێ... لەگێتی نهێنیەوە هاتوم بۆ ئەوەی تۆ دڵنیاکەم، گوڵی جوانت پێ ببەخشم... ، یان پەپولەی نەرم... ، یان چۆلەکەی باڵ ئاڵتونی، جوان...

تارماییەکە بێ دەنگ بو، لاوە چاوشینەکە وورتەی لەدەم نەهاتەدەرێ، ئەو ناوە پڕ بو لە ترسوسام، لەم کاتەدا دەنگێك ئەو جێیە خامۆشەی شڵەقانوو وتی:-

"نەخێر... بۆمباو تەقەمەنیو فیشەکم ئەوێ ئاگر لەگێتی بەر بدەن، تۆپم ئەوێ هەوا کاس بکات، شاخ هەڵتەکێنێ، زەویو ئاسمان تێکومەکان بدا، شیری تیژم ئەوێ جەرگی دوژمنی پێ هەڵدڕم، ئەسپی ڕەسەنم ئەوێ بە ناڵەکانی کەللەی دوژمنی دڕندە و پیسو ناپاك بفلیقێنێتەوە... ئازادیم ئەوێ...... ئازادی نیشتمانی خۆشەویستم..."

---

گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە(7) ساڵی 4 لاپەرە18-21تەمووزی 1943

پێم ئەڵێن تۆ مردویت! پێکەنینم دێ بەم گەلحۆیانە چونکە خۆیان بە گیان مردوون و هێشتا دەرکیان بە مردنەکەیان نەکردووە، ئەوەندە گەوجن هەموو بەرەبەیانێك کە گزنگی هەتاو ئەکەوێت تا زەردەی زەردەپەڕی ئاوابون وام لە رووناکیدا، لەگەڵ ووشەی درەوشاوەی ناوەرۆك پڕ لەپیت و خێروبێر، بەدرێژایی شەوانی تاریکیش خەوت پێوەئەبینم ئەی رووناکی، ئەی باوەڕی ڕاستی مرۆڤایەتی، ئەی شۆڕشی ئیقلیمگیری چەوت و گەندەڵ رامالەری چەسپکەری راستی و هەق و جوانی و یەکسانی.

باکڵ لەسەرمەزارەکەم ئەوەندە بەرزبکەنەوە تا بارستاییەکەی نەگەیێننە ئەستێرەکان با ئەوەندەش گۆڕمان لێ تاریك بکەن، لەسەر ئەم زەوی‌یە هەتا خۆشیان بەشەوارە ئەکەون، تۆ هەر تۆیت و منیش هەر مرۆڤ، هەر من. با لە ناوخۆیا بقلیشێتەوە و بپوکێتەوە دوژمن، شەو چەند درێژبێ هەر ئەبێ بڕێتەوە... گۆڕیش چەندە تاریك بێ و چەند قوڵ و قایم کراو و گڵ لەسەر بارکراو بێ هەر هەڵ ئەتەکێنرێت و تەخت ئەکرێت و زیندو و قەبر، ڕووناکی و تاریکی هەرگیز بەیەکەوە ناژین و هەرگیز بەیەکەوە رانایەن و پیس و پاکیش، ناشیرینی و جوانی هەرگیز یەك حسابیان بۆ ناکرێ.

فەرهاد بێستونی بەدەست کونکرد و بە گیانی پڕلەرووناکی گۆشت و ئێسقان و دەمار و خوێنی کرد بە پۆڵا، بۆ لە یاد چونەوە؟ مەگەر مەرگ!

کێ ئەگری و ئەپارێتەوە و ئەکڕوزێتەوە و لەپەڕرو ئەکەوێ و(دەستێك نەتوانێ بیبڕێ ماچێ ئەکات) کەیفی خۆیەتی... بەلام من... سێبەری فرمێسکیش بێتە پێلوی چاوم شەرتە چاویشی پێوە کوێرکەم و تەڕایی لێ بڕم و بیکەمە وشکەکانی...

من بۆ ئەوە دروست بوم هەر گۆرانیت پیاهەڵدەم و گۆرانیت بۆ بڵێم هەتا ئاوت ئەخەمە سەر هەمو زمانێك، هەتا ئەمرت ئەکەم لە هەموو زەمانێکدا و ئەو شتەی گۆرانی بۆ وترا هەرگیز نامرێ!

## گۆرانی دووەم

شەوێکی تاریکی دەیجور، بەناستەم تیشکێك وا لە دور، ئەشوبهێتە سێبەری نور، لە ناو دنیای کشومات سەگێك لە پڕ حەپەی هات... تومەز خەوی بەگورگەوە دیوە بۆیە وا ئێجگار تۆقیوە.

ئەستێرەی دوری ئەفام دڵداری لەگەڵ ئەشکەوتی خەمباری پڕ لە دەعبا ئەکات.... لە ناو کۆلێتێکی هەرەس هێناوا هەتیوێکی باوك کوژراو لەبێشکەیەکدا توند شەتەك دراو، لەتاو ئازاری لەش و سکی برسی خەو ناچێتە چاوی و ئەگری، دەسرازەی بەن لەشی ئەبڕێتەوە و برسێتی فزەی لێ ئەبڕێ... سەگە هەر ئەلورێنێ... وا منالەکە بێ دەنگ بو تومەز دایکی تواوەی خەم و مەینەتی مەمکەچەقەکانی خستەدەم و لە بێ هێزیدا خۆیدا بەسەر بێشکەکەدا، ئافرەتە ئەکۆکێ... لە کۆکەکەیا دەنگی هەزاران کۆتری سەر بڕاو ئەبیستم... ئافرەتە لاربوەوە و کەوت... سیلی بو، برسی بو، سەرمای بو، مێردەکەی، کەسوکارەیان کوشتبوو واتەمیش مرد... بەلام کارەساتەکان ماون و هەرگیز نامرن... زەق وەك کۆڵەوژی هەق ئەچن بە چاو ماناو پێمان ئەڵێن: درەنگە! نامەردتان ئەکەن درەنگە! رەشەبا هەڵی کرد و کۆلێتی خستە جولە، شەوە و پایز، گەلاریژ بە ئاسمانەوە ئەدرەوشێتەوەو سەرما لە ئێسقان و مۆخ کار ئەکات... گەماڵەبۆر هەر لە حەپەو لورەی پرسام ناکەوێ...

منالِ بێ کەسەو، لاشەبێگۆڕ و کۆلێت بێ کەیبانو کێڵگەبێ جوتیار و دێ بێ ئاوایی و گەماڵەکە هەر ئەلورێنێ... واشەبەقی بەیان دەرکەوت لە دور، ئەشوبهێتە ئاگرێکی سور، گۆرانی بۆ شەبەق بڵێم یان بۆ مرد و بگریم؟! شەرتبێ هەتا ماوم هەر گۆرانی بڵێم! گۆرانی‌یەك ئاوازەکەی ئەلە حەپە و لورەی سەگ بچێت، ئەلەسەرمای پایز و شەوی دەیجور، گۆرانی‌یەك هەرگیز نسرمیو قەبر وسیلی تیا نەبیستری! ئەکەی بگریت، هەتا ماوی هەر گۆرانی بڵێ! ئەکەی بگریت! ئەگینا رۆژێ لە رۆژان سەرچاوەی چاوی پڕ بەزەییت وشك ئەبێ، ئەوکاتیە رونە بریسکاوەیەت ئەبێ بە کوێرەکانی و تەڕایی تیا نامێنێ! رێی سەختی ژیان بەگۆرانی خۆش ئەکرێ، ئامانجی شۆڕشگێڕان بە گۆرانی هیواو ڕق ئەهێنرێتە دی... رووناکی بەگۆرانی ئەژی وسەرئەکەوێ...

(تیاترۆ)

"لەعەرەبییەوە کراوە بە خۆماڵی بەدەستکاریەوە"

هەردوکیان دڵخوازی یەکتری‌بون لەو کاتەدا کە خۆشەویستی وەکو سەرچاوەیێکی بە هێزی ژیاوەی سەرەتای بە هار ئەتەقێ و بە گوڕسەر ئەکات، ئەکوێ ئەداتەسنورو ئەلە بەربەست و بەرهەڵست کۆ ئەکاتەوە. دڵدارییەکەیان لە خۆشەویستی بلبل و گوڵ، پەروانەو چرا، گوڵە ئەستێرەو بە هارنەچو، وەکوچنار و لاولاو گیروەدەی یەکبون ئەیان ئەویست لەیەك جیابکرێنەوە.

لەسەرەتای لاویدا دڵداری و خۆشەویستی پاکەو بەهێز و بێ‌غەش و پڕترس و سارێلکە وەکو جۆری ژیان خۆی، وەکو جۆری هەڵسان و دانیشتن و بیرکردنەوە. شێگیری یەکەیان بۆ یەکتری گەیبوە ئەوڕادەیەی هەمو سەعاتێکی دوری یان بە ساڵ ئەهاتە بەرچاوو هەموکۆ بونەوە یەکیان چەند درێژتر بوایە ئەوەندەلای ئەمان هەر بەکەم ئەژمێردرا لەم بەیەك گەیشتنەپاکانەیاندا لە پاشەڕۆژنەدوان، بەبیروباوەڕی ساکاری فەریکیان کۆشك و تەلاری گەورەیان دروست ئەکرد، پرۆژەی نۆد و سەیریان ئەنەخشاند، یەکتری یان دڵنیائەکرد لە پاشەڕۆژی پڕشنگدار. وەکو پاشە رۆژو دوا رۆژ ئەوەندە ئەرمونیان بێ خۆی بە ئاسانی بداتە دەست مرۆڤی ساکاری دڵسۆزی راستی بێ خەوش.

رۆژێك لە رۆژان(نازەنین) بە (ئازادی) وت کە باوکی خەیکە ئەیدا بەمیرزا رەشیدی دەوڵەمەند کە هەموکاروبارێکی بەدەست ئەوەوەیە و روی لێ ناوە و ناتوانێ بێ دڵی بکات! ئەگیناباری ژیانیان تێك ئەچێ و خراپیان بە سەردێت! ئازاد دەماری رقی جوڵاو سوربوەوە و گەیشتە ئەوڕادەیەی کە کەتنێك بکات.

لەو رۆژەوە شادی و خۆشی باری کرد و خەموداخوزوخاو سەری کرد و هەتا ئەهات هەردوکیان زەرد هەڵ ئەگەڕان و ئەیاندایە باریکی و بنێمی، هەتا ئەهات ئارامو ئۆقرەیان لەبەر ئەبڕاو سەریان زیاتر لێ ئەشێوار ئەخۆراکیان بۆ ئەخوراو ئەخەونەچوە ئەرچاوە سیس بوە شین هەڵگەڕاوانە یانەوە... دوودڵ لە یەکتر کردنی سەرەتای لاوی و دڵداری یەکەم گەورەترین کۆستە لە کاروانی ژیانا. ئازاد هەر چەندە سەری ئەهێنا و سەری ئەبرد هیچ رێیکی کاریگەری نەئەدۆزییەوە بۆ چارەکردنی ئەم کۆستەگەورەیەو ئاو بە ئاویش روی ئەکردە ئاسمان و دڵپڕ لە داخانەئەیوت:- خوای گەورە! ئەمە بۆ؟ ئەئەبوجارێ باجی رەحمەی ژنی میرزا رەشید نەکوژیت هەتا من نازەنینم ئەهێنا؟

ئەوەندە ساكار بو واي ئەزاني ئاسمان ئەكەوێتە فرياي ئەوانەي لەسەر زەوي لێيان ئەقەومێت!

ئازادي قوتابي كۆستكەوتو كردبوي بە پيشە هەموو رۆژێك چەند سەعاتێك لە ژورەكەي خۆي يا لە قەراغ شار تێر و پڕ بەگريان و ئاخ و ئۆف خەمي خۆي ئەدا بەبا، چي بكات؟ تروسكاييەك روناكي نەئەبيني لەم شەوەزەنگي ژيانەدا كە يياري پيري دەولەمەندي ژن مردوو دڵخوازي ئەمي تيا ئەفرێنێ.

ئەو ساڵەي (نازەنين) يان تياگواستەوە نەك هەر ئازاد دەرنەچو بەڵكو نەخۆشيش كەوت و ئەسپەك دايە سەري و كەمێكي مابو شێت و شبر ببێ، بەڵام هەر دڵي خۆي بەوە خۆش ئەكرد كەميرزا ئەمرێ و نازەنين بۆ ئەم ئەبێ.

چەند ساڵێكي دور و درێژي بێ مەعناي پڕكارەسات، هاتن و,تێ پەڕين و پۆل لە دواي پۆلي قوتابخانەيان بە ئازاد تەواو كردو روي كردەيەكێ لە قوتابخانە بەرزەكاني(پايتەخت) ئەو حەڵە تازەپێي نابوە21ساڵي و سەري سوڕما لەو هەمو شتە تازانەي لە شاري گەورەدا ئەي دين لەگەڵ هاورێ تازەكانيشيا بە تايبەتي قوتابياني پاروپێراري قوتابخانە كە لەم شارەزاتر و چاوكراوە ترو بەزاتتربون ئەچو بۆ مەيخانەو عومخانەو بۆ تياترۆش!

شەوێكيان(دنگ) بوبو زماني كۆي نەئەكرد، لەگەڵ هاورێكانيا رويان كردە تياترۆ، سەري مانگ بو نقود لە گيرفانا بو، لە پاش كەمێك خواردنەوەش لێرە كەوتنە پێكەنين و قيژە و قولەيەكي ئەوتۆ سەرنجي دانيشتواني تياترۆخانەكەيان بۆلاي خۆيان راكێشا، ئاو بە ئاويش بەدەم مۆسيقا و گۆراني تياترۆكانەوە ئەمانيش سوڕيان ئەدا و چەپڵەو چەقەنە. لە نيوەي پرۆگرامدا يەكێك لە مۆسيقاژەنەكان بە ميكرۆفۆن بلاويكردەوە كە ئێستا(لواحظ) گۆراني‌يەكي كورديتان بۆ ئەڵێ! ئەمانيش بێ دەنگ بوون و چاويان بڕي‌يە شانۆكە، چاوەڕوان ئەبون ئافرەتێك ناوي(لواحظ) بێ و بە كوردي گۆراني بڵێ لەپڕدەركەوت! ئەو ڕانە نەرمو نۆڵانەي سپيوسورەجوانەي لە بەفروخوێني كوێستان ئەچون، ئەولەشە شوشە رێكەي ئەتوت لە كارگەي خواوەندي هونەرا بە تايبەتي دروست كراوە بۆ(نيگا) لێ وەرگرتن و لە مەعناي جواني گەيشتن خراوەتە پێش چاو، قژێكي زەردي خورمايي خاوو پەخشان، جوتەچاوێكي رەشي ئێجگار گەشي پڕشنگداري پڕ لە ئەفسون وەك كەوێكي سركي سەر گەرمي گەرمەي بەهار هاتە سەر شانۆ و دەستي كرد بەسەما.... ئازاد ناخۆشترين خورپە بە دڵياهات و دنياي لەبەر چاو تاريك بو، ئارەقێكي ساردي كردەوە و رەنگي بو بەزەعفەراني زەرد و خەياڵ لە كەللەيا نەما... چۆن ئەمە(نازەنينە)؟! ئەي كەس وكاري بەمە ئازانن، ئەي ميرزاچي لێ هات؟ گوايە ئێستا من بڕوا بەوە بكەم كە ئەو كچە شۆخە جوانە پاكە، ئەوسورە گوڵە كوێستاني‌يەي هەرچي پێي بوترێ ناپاكي و داوێنپيسي ئەي ئەزاني و بەبيريا گوزەري نەئەكرد بوە بەم سەماكەرە دەموچاو هەڵماڵراوە ئابڕوتكاوە شەرەف شكاوە؟! بڕوابكەم كە نازەنيني خۆشەويست بوە بە لواحظ و لەرێي پارەداو بەرامبەر بەم خەڵكەچاوبرسي‌يە هەمەچێژەيەي لە ژيان رايان كردوە سەما ئەكاو لە شيان پيشانئەدا بۆ ئەوەي مرخ و ئارەزوي‌پيسيان بجوڵێنێ؟ بەڵام چۆن خۆم بخەڵەتێنم ئەوەتا لەبەر دەمما... كاشكي كوێرببومايەو بەم رەنگە هەرگيز نەمديايە!

هێشتا ئازاد سەرگەرمي ئەم ئەنديشانە بو كە سەرەتاي گۆراني هاتەگوێي وەكو لە بيرێكي.ئێجگار قوڵەوە داماوێكي لێ قەوماوي برينداري دەنگ سواو (هانا) بێنێتەبەر خەڵكي نەك ئارەزوويان بجوڵێنێ! گۆراني يەكەي پڕبو لە گريان و پاڕانەوە، لە ئێش وئازار و داخي ناودەرون، پڕبو لە جەورلێ كراوي و جەخارو زوخاو...

كەمانچە ژەني شانۆكەش لاوێك بو خوێندەوارو هونەرمەند و لێ هاتو، دەركي ئەكرد بە هەموو وشەيەكي گۆراني يەكەو تێي ئەگەيشت چونكە خۆشي كوێستاني‌بو، لەگەڵ هەموو پارچەيێكي ئاوازەكەدا شان و قۆڵ و ملوپەنجەي ئەجولاندو بەشێوەي دەموچاوي شيني بەدەمەوە ئەكرد و هەندێ جاريش هەر دوو پێلوي شين هەڵكەراوي چاوي خەولێ براوي پڕ ئەبو لە فرمێسك چونكە ئازاري ئاواز و دەنگي جەور لێ كراوو كوێرەوەري و بۆنەهاتي و ئاوارەيي خۆشي تێكەڵ بەيەك ئەبون، بەدڵ كەواني لە تەلي كەمان ڕائەكێشاو بەگوڕ پەنجەي مردني ئاوازەكەي لە سەري تەل گير ئەكرد و مرۆڤي خاوەن هەستي لە ژيان راكردوي وريا ئەكردەوە.... نازەنين دەنگي لێ هەڵبڕي:

بێ لۆمەيە! وەللە بێ لۆمەيە!

خەڵكە ئەم ئافرەتەي بەروتي ئەيبينن بێ لۆمەيە باوكە پارەپەرستەكەي فرۆشتي بە پيرێك لە زەوي دڵداري پاك هەڵكەندراو بێ لۆمەيە، فڕێ درايە غەريبي‌يەكي پڕترس وسام... لێي مەگرن وەڵا بێ لۆمەيە، فرۆشتيان بە ئافرەتەخراپەكان بە ناپياوە زۆڵەكان، بەمە پڕيان كرد گيرفان، ئەميش غەريب و نەشارەزا وزمان نەزان! لێي مەگرن بێ لۆمەيە، تانوتي لێ مەدەن بێ لۆمەيە! خەڵكە وەڵا بێ لۆمەيە.... لەمە زياتر ئازاد خۆي پێ نەگيرا، چاوپڕ لە فرمێسكي حيرس، دەرون پڕ لە رقوداخ، قورگ پڕ لە بۆمباي جوێن، هەستايە سەرپێ وروە و شانۆ كەوتە نەعرەتەكێشان و جنێودان بە دامەزرێنەراني تياترۆخانە، بەدروستكەري عومخانە، بەلێدەري سكەي پارە، بەم كۆمەڵگا راكردوە بێ بارە.... لە دواي نيوسەعاتێ بەيەكادان لەگەڵ بۆيەكان، راپێچكرا بۆيەكێ لە بەنديخانەكان.... لەوێشەوە بە شێتي برا بۆ شەماعيە- نەخۆشخانەي شێتەكان! ئێستاش ئەپرسي؟

خەڵكەكە هەر وەك جاران رو ئەكەنەوە تياتروخانەكان، ئەڵێي نەبايان ديوە و نەباران، ئەنەرێنن، ئەخۆنەوە، پێ ئەكەنن ئەقولێنن هەتا بەيان راكرد و لە ژيان، لە ترسي ژيان.

(لواحظيش) هەمووشەوێ بە دەستوري شەوان، دێتەوە سەر شانۆ... سەمايەو باپيادان و ئازارسەر ئەكاتەوە وەك زوخاو.... بێ لۆمەيە! خەڵكەبێ لۆمەيە، هەموخراپێكي ناو كۆمەڵگاكەمان بێ لۆمەيە! هەموشێتێكي ناوشێتخانە بێ لۆمەيە! هەمو(قۆچێكي قورباني) بێ لۆمەيە....

رەفيق چالاك

# پێکەنینی دوایی

**(کەوتوم و پێشێلکراوم، بەڵام هەر هەڵئەسمەوە چونکە من میللەتم هەرگیز نامرم. بە قاقاپێم پێ ئەکـەنن ئـەم بـایی یانـە نـازانن کـە پێکەنینی من دواییەو دوایی ئەوان بە ئاسمان، بەبەڵگەی ئایەتی قورئان، "تجمع العظام و هی رمیم، صدق الله العظیم" ئەم دنیایە وا زوو نابڕێتەوە، ئەم کاروانەش هەر ئەگاتە ئامانج!)**

(1)

هیچم نە ئەزانی ساکار بوم، روت و قوت و پێ خاوس، بێ لانە و بێ داڵدەو بێ ئامانج... بەڵام ئەڕۆیشتم! زەوی رەقەن و بەردەڵان، رێی سەخت و پڕجانەوەر، سەرما و گەرما ئەیان هێنام و ئەیان بردم... یاری یان پێ ئەکردم، چونکە زاڵبون بە سەرما! شەوی تاریک ئەستێرە و مانگ شتی بریسکاوە، گرمەو دەنگە دەنگ، هەموو شتێکی ناو کردگارم لاوەك مەتەڵ وابو، هەموو شتێك ئەی ترساندم، نەم ئەزانی پاش تۆزێکی تر چیم لێ دێ، چیم دێتەرێ! خواردنم میوە و گوشتی راوبو، ئەوی ئەو رۆژە خۆم بۆ خۆمم پەیدا نەکردایە نەمبو بیخۆم. خۆشەویستی و خزمایەتیو هەرچی پێی بوترێ سیلەی رەحم هێشتاپەیدا نەبوبو. ئەم بارە ناهەموارە ساکارە زۆری خایان، زۆری کارتێ کردم، زۆری ئازاردام، پێ شێلی کردم، بەڵام هەر هەڵسامەوە و نەمردم.

(با) وەك گورگێکی هار ئەیلوران و بە زەبونیم پێ ئەکەنی، هەموو هێزێکی ناو کردگار بە دڕندەکانیەوە بایی بوبون و گەنجەفەیان بەسەردا ئەکردم، بەڵام لەدواییدا هەر پێکەنیم و نەمردم.

(2)

دنیا دەوران دەورانەو دەور گۆڕرا، ئینجا چەتەوڵێکی فێڵبازم لێ پەیدا بو ناوم لێنا(دێو). ئەم مام دێوە بێ رەزا داوێن پیسە بەم رۆژگارە هەرچی بویستایە پێی ئەکردم، رۆژێك شوانی مەڕ و مالات، رۆژێك ئەی ناردم بۆ راووشکار، رۆژێکیش وەکو کەڵەشێر ئەیدام بەشەڕ! لە بەیانییەوە هەتا ئێوارییەکی زۆر درەنگ هەر کاربو بە دوای کارا، هەر تفوجنێوو لێدان بو... تەقانمیەوە و رەقانمیەوە و بەردی پێ بڕیم و داری پێ هەڵکەندم هەتا دامی بە زەویداو پێ شێلی کردم، بەڵام هەر هەڵسامەوە و نەمردم.

(3)

کۆیلە و دیل، زەبون وبێ پەنا، دروستکردنی خانوبەرەی هەڵسان، بە جوت وگێرە سەرەڕای ئەوەش دەردی سەری و رەنج بێ وەری بەشمبو. خێرو خێراتم ئەهێنایە دی بۆ مام دێوی ئەدیوبدی کە فێری هەزار و هەند خوی خراپ بوبو، کە هەزاران فێڵ و جادوی تازەی بۆ هێنابومەکایە تابیخوا خایەومایە. دێ یەکانمان کرد بە شار، ماڵی ئاغاش پڕکوڵزار، گاڵتەی منالان نییە گاسن و داس و پاچەکۆڵە، خاکە نـــاز و تەشوێو پێمەڕەو مشتۆی پڕ مست هەزار ئەوەندەی بەردی دڕی بێمەعنا کاریگەرتر و بە نرختر و لێوەشاوەتربون. راستان ئەوێ منیش دوای بینینی ئاگر و چراو کەرەسەی ئاسن و ژن وماڵ ترسی جارانم نەما لە خەیاڵ، هەر چەندە جنێوم خواردو زیللـەتم دی و دامـی بـەزەوی داو پێشێلی کـردم هـەر هەڵسامەوە و نەمردم.

(4)

مەکینە کەوتە گەڕ، دوکەڵ بەری ئاسمانی گرت، گەشەو شادی و پێشکەوتن و دڵنیایی و پێویستی پێویست کەوتنە ناو ئاوان، خوێندن و زانیاری و زانست، مۆسیقاو هونەری جوان تێکڕا بەریان بەرەڵابو، وامان زانی بەسەرچوو ڕۆژانی تاریکی دوابڕاو، ئیتر هەرگیز نایبینینەوە بەچاو کە تەماشای خۆمم کردو کەمێك وردبومەوە جلەکانم رەش داگەڕابو، بە حاڵ خوێنم تیامابو، هەموی مژرابو... مەکینە ڕای ئەماڵیم و منیشی بە چاوی نەوت و رۆن و کەرەسە ئەهاتە بەرچاو! پێ شێلی کردم، گرمە گرمەکەی پێکەنینی سەرکەوتنە درۆزنەی پڕ لە غەڕایی و غروربوا لە پاڵەوە سەرێکم لێ بەرزکردەوە و بەبایی بونی ئەمیش قێزم هاتەوە چونکە(مێژوو)ی لە بیرچۆتەوە! نازانێ کە هەرگیز نەمردوم و نامرم با مەکینەش پێشێلی کردبم.

(5)

ئینجا نۆرەی خۆرێکخستنەو نەخشەی چاك و جۆشان و گرتنەدەستی مەکینەو زەوی بکەین بەبەهەشت و کۆشك و تەلار و ئاوەدانی و شارستانی، سەرما و گەرما و هەرچی هێزێکی شاردراوەی تۆقینەری جاران هەیە هەمووی بکەین بە ئەمرستیلەو لە پەنجەمانی کەین هەموو کەسێك تێربێ و شاد، هەموو یەکێك بکاتە ئاوات، ئەڕق بمێنێ و نە کینە نە گەنجەفەو نە لورە، روبکەینە هەرسوچێك بە هاربێ و شادی، خۆشەویستی بێ و گەردن ئازادی، جێژن بێ و نەورۆز، هەموو شتێکیش جوانبێ و پیرۆز!

ئینجا پڕ بە دڵ پێنەکەنم، پێکەنینێکی بێ غەڕایی، پێکەنینێك هەمو روی زەوی بگرێتەوە... بێ گومان دوژمنانی میللەتان، دوژمنانی ئینسان کە لە ناو دلانا، لەپەڕەی مێشکا، لە قوڵایی مێژوودا نوسراوە و بڕیار:- ئەئینسان نەمرێ و نەمیللەتان، پێکەنینی دواییش هەمیشە بۆ میللەتانە.

رەفیق چالاك

گۆڕهەڵکەن

# نموونەی وەرگێڕان

## وەرگێڕانی رەفیق چالاك

گۆڕهەڵکەن:

پێشکەشە بۆ:

ئەوانەی گۆڕوایە(گۆڕیان) بۆ هەڵ نەکەندرێت!

بۆ ئەوانەش کەزیندوون و کەچی وان لە(گۆڕیشا) چونکە هیچ زیندویەتیەکیان پێوەدیارنیە!

پێشکەشە بۆ:

هەموو زیندویەکی مردوو، بەڵکو هەست بە زیندویەتی خۆیان بکەن و(گۆڕ) هەڵ تەکێنن!

ئەوی گۆڕیش هەڵ ناتەکێنێ خوای ئەکرد ئەرزا!

رەفیق چالاك



### سەرەتا

خوێندەوارە خۆشەویستەکە!

کچ بیت یان کوڕ، ئازابیت یان ترسنۆك، هەژاربیت یان دەوڵەمەند، تێگەیشتوبیت یان کەم فام، خۆشت بوێم یان قینت لێم بێت کەیفی خۆتەو شتێکن ئەمانە بەخۆت!

چونکە من بۆ ئێوە هەمووتان ئەنووسم بەوزمانەی کە باش تێی ئەگەن، ئاوات و ئازار وهەستی ئێوە دەرئەبڕم من ئێوەم و ئێوەش من، ئینجا خوای ئەکرد شەقی ئەبرد ناپاکی دووژمن!

مۆمێکم داگیرساووم و ئەسووتێم، بەقەد توانای تیشکم بەرپێتان بۆ روونـاك ئەکەمـەوە، شـەوەزەنگتان بـۆ ئەڕەوێنمـەوە و بە تـەمای هیچـی کەسیش نیم، قینم لە کەس نیەو هەمووتانم خۆش ئەوێت! دوژمنەکانم، دۆستەکانم، بێگانـەکان و کەسـەکانم! مـن ڕابـەری زۆربـەی زۆرم کـە بەهەمووتاقەت و توانا یەکمەوە ئاڕاستەی کامەرانی و شادیی و خۆشی و جوانی وخێر ئخوایی ئەکەم!

ئیتر گێرەشێوێنە کورت بینە سەلبیە کەرترەکان (دوور لـە ڕووتـان) چیئەڵێن با بیڵێن چونکە هێشتا نەبوون بە پیاو، بۆنی شیری خاویان لە دەم دێـت، ڕۆژێـك ئـەبێ پەشـیمان ببنـەوە! نـاوی زنجیرەکـەمان کـرد بە"زنجـیرەی چـیرۆك و نووسـینی نـوێ، پشـت بـەخواو بـە خوێنـدەوارە بەغیرەتـەکان هـەر لەسـەربڵاوکردنەوەی زانیـاری هەمـە جـۆرە ئـەڕۆین و لـە(مۆمیـەتی) خۆمـان ناکـەوین، گەنجینـەی ئـەدەبیاتمان ئەڕازێنینـەوە، ئیملاونووسینی نوێی کوردی بلاوئەکەینەوە!

بەردی بنچینەمان زانیاری ڕاستەقینەیە، ئامانجیشمان خزمەت کردنی هاووڵاتیەکانمانـە کـە پـیرۆزترین ئامانجە! ئـەوی بـەم کارکردنـەو بـەم دەسـتەبەرەی خزمـەت کردنـەشمان ڕازی نیـە و گـەزارە دەرئەکێشـێ و نووسینەکانمان ناخوێنێتەوە چش!

ئەزانن بۆچی چش؟! چونکە بێ گومان بن کە گێرەشێوێنە کورت بینە سـەلبیە کـەرترەکان لـە گۆڕهەڵکەنـەکانن خـەریکی هەڵکـەندنی گۆڕێکـی قووڵن! ئەوی گۆڕیش بۆ خەڵقی هەڵکەنێ خۆی تیا ئەنێژرێ!

سوپاسیش بۆ ئەو هاورێ پیاوانەی پشتیان گرتوم و پاڵم پێوە ئەنێن بۆ خێرخوایی و گورم بەگورترنەکەن!

بۆ ئەو پیاوو لاوانەی لەرێیەکی بێ گرێ و قورتی ئیجابی پڕ لە گیانی میللی ڕاستەقینەوە چاکی خزمەتیان کردوە بەلادا و ڕووەوپێشەوە هەنگاوی مەردانە ئەنێن، کوردانە پێشەنگی خێرخوایین!

ڕەفیق چالاك

# لەگۆڕستانا

زەردەی زەردەپەر تك تك ئەتکێت بە سەرگۆڕستانا! لەزەردەخەنەی باوك مردووی بێ دەرەتان، لەکاتی کوژاندنەوەی تیشکی مۆم ئەچی، ئەڵێی خەوێکی پڕناسۆرە، ئەڵێی کاتی گیانەڵاوی هیواو ئاواتە، ئەڵێی فرمێسکی لێ قەوماوان و داماوانە! لەو بەری گۆڕستانەکەوە نزیك بەگومەزەکان پۆلێك باڵندە فڕی لە تاپۆی خێوی ماڵێکی کۆنی ئەکرد کە لە چیرۆکی کۆنا بیستومانە، ئەوخێوانەی زراوی خەڵقی باوەڕنەبووی ساکاریان ئەتۆقان...

گرد و گومەز و دارستان تێکرا هەموو گۆڕستان نیشتنە باوەشی تاریکییەوە و لە چاو دووركەوتنەوە...

کوندەبەبووی شووم قڕاندی... لەو شوێنەڕووخاوە سامدارە تاریکەدا ئاوازی مردن، سرودی وێران کاری ئەگێڕایەوە، دەشت و دۆڵ و شاخ و گردیش دەنگیان ئەدایەوە... هەوا دەنگ دانەوەی ئاسۆر و ئازاری لەم گردەوە ڕائەفڕان بۆ ئەو گرد، هەندێ لە کێلەبەرزەکۆنەکان لە ئافرەتە جادووگەرەکان ئەچوون کە پەنجەی درێژی ڕەقهەڵاتوو یان بەرز کردبێتەوە بۆ ئاسمان، تیپەقەلێك لە دوور لە ناو ئاسۆدا کە هێشتا تۆزێك ڕووناك بوو هەوا ڕای ئەفڕان، لە دەنگی شوومی کوندەبەبوو، لە دەست دەست و پەنجەی جادووگەران، لە ترسی کێلی گۆڕستان، ڕایان ئەکرد بۆ شوێنێ دوور تا لە چاویان ئەبڕێ نوور! کرمی پیسی گۆڕستان چاویان بڕیبوە پاشماوەی تۆزقاڵە ڕووناکییە ئاساوەکە، ئەوەندە چڵێس و چاوچنۆکن ئەیانەوێ ئەم تۆزقاڵەش قووت دەن! مردووەکان سەریان بەرز کردەوە و بەردی ئەلحەدیان هەڵپڕی، گۆڕی قایمکراویان هەڵتەکان، بەمەشەوە نەوەستان، کفنیان دڕی و هەڵسانە سەرپێیان، ڕێ یان گرتەبەر بەشەکەتی، تینوو برسی، ڕەو ئاسۆ کەوتنە هەنگاونان، پێ یان لە زەوی ڕائەتەکان، هەموو بستە زەوییەکی ناو گۆڕستان: کێل و قەبرو دارنەرخەوان، گومەزەکان، شوورەکان، پردەکان هاتنەلەرزە ژێری گۆڕستان بوو بەبوومەلەرزە، تارمایی سێبەری عەشام ئەکشا بۆ دوور ئەشوویها بە شەوی ئەیجوو... چاویان ئەگێڕا بۆ نوور، ئەوچاوانەی هەتا بڵێی سوور!

لەولای گۆڕستانەوە تارماییەکی درێژ دەرکەوت، لەبێ هێزیدا ناو بەناو ئەکەوت، قاچی بە شوێن خۆیا ئەخشان، پاچ و پێمەڕە لەسەرشان: گۆڕهەڵکەنە هاتوە بۆ گۆڕستان لە پاش کەمێك تاس بردنەوە و سەرسوڕمان، لە بندار ئەرخەوانێکا وەستا و ئارەقی سڕی، چاوە بە قووڵچووەکانی لەڕێی شار بڕی! بە لەپە قورسە ساردەکانی، کە لە ناوچەوانی کەرپیاوان ئەچوو، هەوای قەبرستانی دڕدا، وەك گورگێکی برسی حەپس کراو خۆی ڕائەکان... کەلەبەری دەمی دەرکەوت، دانە بەگۆشت فێر بووەکانی ڕیچ ئەچوونەوە، چاوی بریسکە ئەماوی گریان لێ بڕاوی کردە ئاسمان، ئەو لەپانەی لێ ڕاوەشان، هەموو دەمی لێ داچەقان:-

(ئەی ئاسمان! واشەوداهات، ئەستێرە هەڵات، ڕێ چۆڵ و بە تاڵ.. کوانێ مردوو؟ کوا تەرمی ئینسان؟ بارکەڕۆ ڕۆڵەڕۆ لەخۆدان، جگەرسووتان سینەبریان، بۆ نابیەم هاواروگریان؟!)

هەوا ووژەیەکی لێوەهات: ئەو قەلانە بۆ ئەقیرێنن؟ دنیا هەردنیایەو هیچی لێ نەهاتوە! خەڵقی هەر خەڵقین و هێشتا هەر ماوون، ئەخۆش برسی لە هەرەتی گەنجیدا سەریان سپی ئەچێتەوە وەك ئێسقانی مردوو، بەڵام هێشتا هەرماوون هیچیان لێ نەهاتوە! کوندە بەبوو بۆ ئەقیرێنێ؟ گوایە لەبەرمردنی ئیزرائیل؟ ئینجا ئەمرێت چش! منیش ئەمرم ئەمڕۆ سبەینێ، کێ هەیە نەمرێت؟!

گۆڕهەڵکەن ڕاچڵەکی، ئامباڵای لە داخا لەرزی و دەستی لە ئاسمان ڕاوەشاندەوە و ئەڕاندی:-

پێم ناڵێی کەی قینت هەڵ ئەسێت؟ تێم ناگەیێنی مەنجەڵی مەردانەکەی ئەکوڵێت؟ کەی ئەوەی بەرەی تاریکی غەور ئەکەی، کەی ڕەجمی خوێن فرۆش و تاوانکەر ئەکەی کەی؟! کە فەوت بوون و نەمان بێ ئەنجامی زیندوان، بۆ ئەم ئێوارەیە لە ناویان نابەی بۆ؟ وا لە تینوانا ئەخنکێم وا لەبرسانا ئەمرم، وا لە بێ دەرامەتیدا شێت ئەبم شێت! وا بوو بە هەفتەیەك... حەوت ڕۆژی ڕەبەق کە لە من بە حەوت ساڵ تێ پەڕی، قەبر بە تاڵ و حەتاڵ ودەم کراوە و چاوەڕوانە، هەر هەڵکەندنی منەو پڕکردنەوەی با، هەر تاریکی یەو باوێشك ئەدا، هەر فرمێسك و زووخاوی مردوانە و قەبرەکەم پڕئەکات لە ئاو، گڵ لاشەو کەلاك ئەمژێ، تەڕییان تیا ئامێڵێ، پێستیان گۆشتیان ئێسقانیان ئەڕزێنێ، کەللەسەریان ئەپروێنێ، لچ و لێوو کۆنایان هەڵ ئەقرچێنێ! ئەی مەمك؟ بەڵێ ئەو مەمکە جوانانە، ئەو بەیە توندو تۆڵانە شل ئەکات ئەیان گوشێ هەتا لە گۆپکە سوورەکانیانەوە خوێن و کێمیان لێ دەرئەکێشێ، هاوار بۆ ئەو مەمکانە، بۆ ئەو چاوانە، بۆ ئەو لێوانە! هاوار بۆ لەش و لاری جوانان، بۆ دڵی دڵداران، بۆمێشکی تێ گەیشتوان و زانایان، بۆ هیواو ئاواتی بابردووی هیوابڕاوان!

ئایا شەوی تاریکی چەپەڵ؟ کرمەپیسەکەی ناو گڵ، دەعباو جانەوەری گەوج، بەمەرگی ئاغایانەوە ڕادەی خواردنی ئەم خۆراکە نایەبانەیان ئەکەوێت؟! دەك لێڵاییم دایە بۆ ئەو لەش و لارە جوانانەی گڵ دەستی کردۆتە ملیان، بۆ ئەومەمکانەی بەرد گۆڕەو شاریان ئەدا، بۆ ئەو لێوە سوورانەی قۆڕمۆڕی کردوون، بۆ ئەو مێشکانەی کرم و دەعبانەمیان تێ ژاندوون!

ئەمە دادی پێ ئەڵێن منی ڕەبەنی زەلامی "گۆڕهەڵکەن" هەتا ئێستا ئافرەتێکم نەبێ و هەر بە هیوابژیم لە کاتێکاکە بە هەزاران کچی عازەب لە ژێرپێما کەوتوون و بوونەتەخۆراکی مارومور! ئایا کە پارە وموچەی تەواوم بۆ نەبڕایەوە ئارەزووم بۆچی پێ درا؟ چی لە ئارەزووی بێ پارەبکەم چی؟!

کوندە بەبوەکانی گۆڕستان، واشەو سیسارك و قەل و داڵی سەرلاك[*]

## پەراوێز

ئەنوسینە لە دەستنوسێکی مامۆستا ڕەفیق چالاکەوە وەرگیراوە.

# ١- لە ئەدەبی خۆمانە : زەنگی کاروان

**(لە دەمەو بەیانێکدا پێش ئەوەی ڕەنگی مەیلەو ئاڵی شەبەق ئاسۆ ڕوون و جوان بکا زەنگــی پێشـەنگی کـاروانی قەشـەنگ ئەلەرێتـەوە و دەنـگ دانەوەی هەموو گۆشەیێکی دنیای خامۆش ئەشلەقێنێ، مژدەی هێنانـەدی ئامانج و ئاواتمان پێ ئەگەیێنێ!**

**ڕۆژ ئەبێتەوە و زەنگوڵە ئەزرنگێتەوە و باوێشـــك و خۆکێشـانەوە لـەناوچیا بەرزە سەرکەشەکانا ئەبێتە نـــەرێتێکی ئێجگـــــار ناپەســـەند! ژیـــان بـــێ زەنگی کاروان، بێ بینینی لادێی شادی جوان، دۆزەخەو سەقەر، هیوابڕاوو وورەبەرداو تام لە بوونی نابینێ و گۆڕی گۆڕە!)**



**رابەر**

وادیسان زەنگی پێشەنگی کاروانێکی ترم هاتەوە گوێ، کاروان ئەرواو زەنگوڵـە ئەزرنگێتـەوە، دەشـت و دۆڵ وچیـا بـەرزەکان دەنـگ ئەدەنـەوە، کردگاری نوستوو چاوی خەواڵووی ئەگلۆفێ، هەموو گیاندارێك دڵی ڕوون ئەبێتـەوە.... وەستاوم بیرئەکەمـەوە، ئـەو ڕۆژە ئەهێنمـەوە یـاد کـە لـەم شوێنەدا لەیەك کراین، کاروانێکی وەك ئەم کاروانە بـەم ڕێیـەدا تێپـەڕی، جەرگی منی بری کە تۆی لێ دوورخستمەوە، کە تۆی لێوون کـردم، تـۆ بڵێی کاروانێکی تر تۆم بۆ بهێنێتەوە، بەیێکمان بگەیێنێتەوە؟!

لەنزارە سەوزە پاراوەکانا ڕانێك ئەبینم ئەلـەوەڕێ، شوانێکی دڵدار بە شمشـاڵ نـازاری دەروونـی دەربـڕێ، ئێوارەیـەکاتی زەردەپـەر، ڕۆژی دەمکـەل چاوشـارکێم لەگـەڵا ئـەکاو بەشـەرمەوە تێـم ئەگـەیێنێ و هیـوام ئەنێتەبەر، کە وا شەو بەپرتاو هات ئەزانی چەند شادبووم بە ئاوابوونی خۆر کەپێی وتم خۆت ئامادەکە بۆ بینینی دڵدار، لە ژێر ڕەشماڵی شەوی تووندو تار ئەی بەسزمانی بێ قەرار؟!

لەبەر تۆیە حەز لە شەوو تاریکی ئەکەم! ئەوشەوو تاریکیەی ئەمان گرێتە باوەشی و لە چاوی بەد بە دوورمان ئەخا، ئەو شەوو تاریکیەی جێگامان بۆ خۆش ئەکاو ڕێگامان بۆ ئەمین ئەکاتەوە و چاوی ڕەقیبمان بۆ کوێرئەکاو من و تۆ ئەهێنێتە جووڵە و ئاخ بە بادان و وورتەی پڕ ووشەی جوانی پرفکری بەرزی پڕ داوێن پاکی پڕ مۆسیقامان ئەخاتە سەر زمان!

کە سەگەکە وەڕی خۆم لە پەنای دیوارا مەڵاسدا و نقەم لە خۆم بڕی! بە سەگە پڕ سفەتەکەتان بڵێ کە پێم نەوەڕن چونکە من دوژمن نیم و لەو زومرەی وەفادارانم، تێیان بگەیێنە کە منیش وەکو ئەوان هەتا ڕۆژ لەبەر دەرگا یاساوڵ و پاسەوانم، پاسەوانی لەیلی شیرنیم ئارامی گیانم، چرای ژیانم! بەسەگەکەتان بڵێن کە ئیتر نەوەڕێ چونکە گۆمی هێمنی شەومان لێ ئەشڵەقێنێ، ڕەقیبی بەدمان لێ ڕا ئەپەڕێنێ! پـێی بڵـێ کە کـەس دوژمنـی تۆنیە چونکە گوڵ خۆشەویستی هەموانـە و هیـچ دڵ ڕەقێکـی نـاو ئـەم جیهانە زات ناکا دەست درێژکا بۆ ئەو گیانە کە بێ گرێ و قۆرتەو ڕەوانە، کە چل چرای بەهاری پاراوی ژیانە!

ئەی پۆپە بەرزەکانی شاخی سەرکەشی پڕ لە ئەبەزین! ئەی لوتکە سپیە بە بەفردا پۆشراوەکان! بەرزی و سەرکەشیتان نیشانەی پاکی و ئەبەزین و بەهێزی تانە! ڕەنگی سپیشتان لەهەموو کەسێکی ئەگەیێنێ کـە دانیشتووانی نـاو ئـەم چیایانە دڵیان پاکە و نیهادیان سافەو هیچ زیانێکیان بە هیچ شتێك ئەگەیاندووە بێ گەردن وەك ئەو بەفرە! یارەکەی منیش وەك ئەو (سپی) یەو کە زۆرم تەماشا کرد ترس ئاوی چاوم ئەبا چونکە هەرگیز بۆم (دەستەمۆ) نابێت! ئەتوانم زەوی ببڕم و بکەومەڕێ و بگەمە ئەو پۆپە بەرزانەو بگەڕێم ئەو لووتکە سپیانە، بـەڵام کوێرەوەریی من لەوەدایەکە ناتوانم بگەمە دڵی یارەکەم! لەگەڵ ئەم بێ هیوایی و جەرگ براویەشا هەر بە تـەمام و(کۆڵ) نـادەم و لـەدامێنا وەستاووم چاوەڕوان، چاوم بڕیوەتە لووتکە بەفرینە بەرزەکان کە گەیشتوونەتە ئاسمان هەرتۆم ئەوێ و تۆ،هەر بە تەمام هەتا ئەنجام! پۆپەو لووتکەی سپی، ڕەنگی تۆسپی و دڵی منیش خوێنی لێ ئەتکێ، خوێنێکی سووری پاکی دڵسۆزی، شەرت بێ هەرگیز چاو بەدامێنا ئەخشێنم و هەر ڕووبکەمە بەرزی، شەرت بێ واز ئەهێنم هەتا ئەم خوێنە سوورەم تێکەڵ بەو بەفرە سپییە نەبێت! ئەزربێت لەسەرم هەتا شەبەقی بەیان وەك زەردەخەنەییکی جوان ئەکەوێتە سەرلێوی ئاسۆ، من کراسێکی بەفر و خوێنت بۆ دروست بکەم، کراسـی شەوی بووکێنـیی لاوێکـی خێرنـەدیوی ناکامی زاوای پەردەگیر!

**سەرچاوە**

**گۆڤاری پەیام، ژمارە288، ڕۆژی دووشەمە 4ی نیسان 1995 بەرگ(7)**

# 2-لە ئەدەبی خۆمانە: زەنگی کاروان

### بەشی شەشەم

**ڕابەر**

لە دەمەو بەیانێکدا پێش ئەوەی ڕەنگی مەیلەو ئاڵی شەبەق ئاسۆ ڕوون و جوان بکا زەنگی پێشەنگی کاروانی قەشەنگ ئەلەرێتەوە و دەنگ دانەوەی هەموو گۆشەیێکی دنیای خامۆش ئەشلەقێنێ، مژدەی هێنانەبیی ئامانج و ئاواتمان پێ ئەگەیێنێ!

ڕۆژ ئەبێتەوە و زەنگوڵە ئەزرنگێتەوە و باوێشک و خۆکێشانەوە لەناوچیا بەرزە سەرکەشەکانا ئەبێتە ئەرێنێکی ئێجگار ناپەسەند! ژیان بێ زەنگی کاروان، بێ بینینی لادێی شادی جوان، دۆزەخەو سەقەر، هیوابڕاوو وورەبەرداو تام لە بوونی نابینێ و گۆڕی گۆڕە!

(ڕابەر)

گوڵەکەم! بووکی کوردستان!

کاروان هەروا لە ڕۆیشتنایەو زەنگ هەر ئەزرنگێتەوە، نیشتمانیش سەرتاپا بەپێ دەشت و گردو دۆڵ و بنار و نزار و شاخیەوە ڕازاوەتەوە و ڕەنگینە، بەهارەو ڕۆژێکی هەتا بڵێی شیرینە! ئەم بەهارە پاراوە جوانە چیرۆکێکی ئێجگار کۆنی لەگەڵ خۆیا هێنایەوە، بیری شەکەتی منی خستەوە باری لێکدانەوەی بێ برانەوە! ئەڵقە ئەڵقەو یەک بەدوای یێکا زنجیرەییێک چیرۆکی کۆنی باب و باپیران وەک شریتی سینەما، و وێنەی تەلەفزیۆن بە پەردەی مێشکا تێپەڕی، ئەم چیرۆکە نە نووسراوەتەوەو هەر لە تیشکی منی ڕەنجەڕۆدا چەسپەوبەند، بەتاوانی ئەزانم بۆتی نەخەمەسەر کاغەز و فڕێ نەدەمە ناو نەوەی ئەو قارەمانانەوە کە بەشی زۆریان لۆتیەتی و ڕووتی و بێگانە پەرستییان کردۆتە پیشە لە ڕێی سوود پەرستیی پیسی خۆیانا، بەڵکو ئەمە خوا یە هۆشیان بەبەرابێتەوەو ڕەگی مەردایەتی یان بجولێ و خۆیان لە زومرەی زۆڵەک دەرکێشن، ئیتر ئەوەندە خۆیان و کیشوەرەکەیان نەفرۆشن!

گوڵە شاخاوی یەکەم! بە نەوەی ئەو قارەمانانە بڵێ: کە باب و باپیرتان لە ڕێی ئێوەدا بوونە قۆچی قوربانی، کەچی ئێوە خەریکی ناو سڕینەوەی ئەوان و خەریکی پێشێل کردنی میراتی پیرۆزی ئەوانن، خەریکی فرۆشتنی هەموو دام و دەزگاو ئابدە و پەیکەرێکی قارەمانی شکۆ دارمانن! ئای کە داخە کوڕ باوکی بفرۆشێ بۆ دەست کەوتی چەپەڵی خۆی نەک بۆ ئامانجێکی بەرزو پیرۆزی میللی! ئای کە شوورەییە پیاو پێ بە زمانی خۆیا بنێ! چەپکە گوڵ بخاتە سەر گۆڕی باوکی پیاوکوژان و ئەو دەستە ماچ کا کە هێشتا سوورە بە خوێنی براکەی!

ئینجا با چیرۆکی قارەمانەکانت بۆ بگێڕمەوە گیانەکەم: لە زەمانێکی زۆر کۆنا نیشتمانی جوانمان بە بەهاری قەشەنگ ڕەنگین تر بوو بو، ئاسمان پێ ئەکەنی، جەنگەڵستانەکانمان ئەتریقانەوە، فڕندەو ئاژەڵ لە دەماغا بوون، ئەمان شاد و ئەوان لە خۆشیان ئەیان جریواند، بۆن و بەرامەی خۆشی گژوگیاو گوڵە کێویلە سەرتاپا کردگاری مەست کردبوو، هەموو مرۆڤێکی ئەم وولاتەش خەریکی کاروباری ڕۆژانەی خۆی بوو، گشت کاروفرمانێکی مەردی دڵسۆز، زەخیرەبوو ئەخرا بۆنەوەی دوا ڕۆژ، باش سەرنج بدەرە نووسینەکەو دڵ بدەرە چیرۆکی خەباتی سوارچاکەکانی ئەم شاخە سەرکەشە ئەبەزانەو لەبیری نەکەی ئەم قسانە: قارەمانەکانمان هەمیشە نزیک بە پۆپە قووچە سەر بەفرینەکان ئەژیان بۆ ئەوەی نزیک بن لە هەور و ئاسمان و لەهەمووشتێکی بەرزی جوان! پێ دەشت و جەنگەڵستانی چڕ و هەموو شوێنێک کە وولاخی



پیابروا جێگای ڕابواردن و گەشت و گزاریـان بـوو، بـەدەم ڕاوەوە دنیایـان تـەی ئـەکرد، شەویشیان بە شیعر خوێندنەوە و چیرۆك و داسـتان گێڕانـەوە و ڕێی شـوون دانـان ئەبردەسـەر تاکاتێکی درەنگ ئینجا دەسـتیان ئەکردە ملی بەرزی و شکۆ، خەو ئەچووە چاویان بـەلاّم دڵیان هەمیشە بەخەبەر بوو! لـە دەمـەو بەیانیشـا چالاکانـە ڕائەپـەڕین، لاوچاکانـە ئەکەوتنە خۆیان و شۆڕئەبوونەوە بۆ بنار، یەك یەك و بەقەتار، شۆڕە سوار هەی شۆڕە سوار! شـوان ڕانـی ئەلـەوەڕاند ئـاوازی شمشـاڵ و گۆرانیـی کـوردی هـەزار کچـی ئـەکرد حـەیران، حیلـەی. ئەسـپی کەحیلـەی چیابڕ، کردگـاری ئەخرۆشاند، بەتایبەتی کە ئەکەوتنە چەپۆکان! لـە نزیـك کـانیی دێ، پۆلـە کچـی بالاّبـەرزی قەدباریکی سنگ بەرزی بەژن شووش بە پرچی درێژی خاوی ئاڵتونی، وە بە چاوی پڕ لە پاکی و بەرووی بێ گەردی نازکیانەوە دیمەنی جۆری بەهەشتیان لە مێشك، لە دڵ، لە کانگەی هەستی ئەچەسپاند، کوڵـم ئـاڵ و لێوسـوور، دەسـت بـەگۆزە ومێخـەك بـەند لـەمل، خۆیـان گـوڵ و گوڵیشـیان دابوو لەسـەریان و پـێ بازیـان لـە فەرشی گـوڵ ئـەنا، دڵـی بـێ دڵیـان دەرئـەهێنا، زەردەی پرشەرم و پێکەنینی بە کوڵ هەرلەو دەم و لێوانـە ئـەهات! سـوارچاکە قارەمانـەکانمان ئەڕۆیشتن بۆ دوور، لـەدوای مـاوەیێکی زۆر کـە ئەگەڕانـەوە گۆرانـی سـەرکەوتنیان ئـەووت و تـەپڵی بازیـان لێ ئـەدا! سـەدای غـەڵبـە غـەڵبیان دەنگی ئەدایەوە و نیشتمانی ئەهێنایـە جۆش! بـەلاّم ئـەم شادمانی و بـەختیاری یـە بەخۆشـی ئەچووەسـەر، لـەپڕ ڕۆژێـك سـوپای یۆنـان و ڕۆمـەکان وەك لافـاو ڕووی کـردە ئـەم ئـاوە و پیامانا هاتن ، دێیان ڕووخاند، شاریان تـالاّن کرد، جەنگەڵیان سووتاند، هـەرچیپارە و پوول و هـەرچی داراییێکمـان هـەبوو بردیـان، هـەرچی کتێبێکی نووسـراومان هـەبوو دزییـان لـە دوای کـــوشتن و بڕینمان، ئینجا بۆی دەرچوون وەك بـەرزەکی بانـان! بـەلاّم خـەیاڵیان خـاو بـوو بەسەریانەوە ئەچوو... لەهەموو لایێکەوە فوو بە کـەرەنادا کـراو تـەپڵ لێ دراو ئـاگر داگیرسـینرا، سوارەکەوتە خۆی، زرێ و کڵاو ئاسن لەبەرکرا، نێزە بەدەست،، شیر لـە کێـلان، ئـاوزەنگی پـان پیاهێناو چوونە مەیدان پڵنگ و شێران، کچمان، کوڕمان، باوکان، دایکان، مەردانە

جـەنگین سـەریان لێ تێکـدان یـەك بـەدە سەندیانەوە تۆڵە لە ڕومیەکان و یۆنانیەکان، لە گشـت داگیرکـەراکان! بـەم جۆرەبـو ڕاکردنیـان، بۆیە(زەینەفۆن) مەجبور بوو بنووسێ ناومان لە مێژوودا ماوە و هەر ئەمێنێ هـەتا ئاخرزەمـان! ئێسـتاش وەك ئـەبینی هـەر بـەرێوەم لەگـەڵ کـاروان، ئەزرنگێتـەوە زەنوڵـەکان لـە ڕێگـەیان، لەناو شاخان، لە لادێکـان، شـارەکان هـەردەنگ ئەداتەوە، زەنگ هەتا ئەگەینە مەڵبەندی قەشەنگ بەسەری زۆڵەك بەسەری فەرەنگ.

ماویەتی








# شهادة دار المعلمين الريفية

العدد ٤٥٤

ان السيد رفيق بن توفيق محمود قد اكمل الدراسة المقررة في دار المعلمين الريفية من سنة ١٩٣٧ الى سنة ١٩٤١ واحرز ٨٥٨ درجة من مجموع ١٣٠٠ درجة وبذلك اصبح اهلاً للتعليم في المدارس الريفية .

اعطيت هذه الشهادة في اليوم السادس عشر من شهر رمضان المبارك سنة الف وثلاثمئة وستين الموافق لليوم الثامن من شهر تشرين الاول سنة الف وتسعمئة واحد واربعين

نصادق على ذلك .

وزير المعارف

مدير دار المعلمين الريفية

مدير المعارف العام

---

معهد الموسيقى والفنون الجميلة

العدد/ ك
التاريخ ـ ١٩٥٦/٧/٢٨

الى ـ مديرية معارف اللواء

الموضوع/ محاضرات التمثيل

نظرا للحاجة الماسة الى مدرس للتمثيل ، يرجى الامر بالايعاز الى السيد رفيق جالاك مأمور مخزن حقل بكره جو للحضور في المعهد ، وذلك لالقاء المحاضرات على طلاب فرع التمثيل في المعهد المذكور واعلامنا .

و. مدير المعهد الموسيقى
والفنون الجميلة
عبد القادر رشيد

# چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕەفیق چالاک

***: وەکو زانیومانە لە رۆژنامەی برایەتییـەوە خـەریکی سـاغ کردنـەوەی مێژووی هونەری کوردیت، ئایا گەیشتویتە کوێ؟**

-: ماوەی چەند مانگێك لەمەوبەر و لەبەر چەند هۆیـەك دەستم کرد بەنوسینی زنجیرە وتارێك سەبارەت بە بیرەوەری خۆم لە ریزی هونەر، یا کاروانی هونەر ئەم زنجیرە نوسینە بوە هۆی ئەوەی لە خۆم بپرسم کە بۆچی منیش وەکو خەڵکی پێش خۆم کەمتەرخـەم بم سـەبارەت بـە گـەلێك ناتـەواوی نـــار کۆمەڵگاکەمان، بۆچی هیچ نەبێ هەوڵی ئەوە بدەم کەرەسەیەکی راستی مێژووی دەست پێکردنی هونەری شانۆ و گۆرانـی و مۆسـیقا وبەشـەکانی کـەی هونـەر بدۆزمـەوە وساغبکەمەوە و بینوسم تاسبەی رۆژێ بناغە و سەرچاوەیەك بێ بۆ مێژوویەکی راستی هونەری کورد.

بۆ ئەم مەبەستە بە مێژوودا چومە خوارەوە هەتا گەیشتمە ئـەو قەناعەتـەی کـە لـە سـاڵی1925دا وەبـە هـاندانی خـوالێ خۆشبوی ئەمر مەحمود جەودەت، شـازاد صـائب وە خـوالێ خۆشبو صالح قەفتان وە هەندێکی تر بزوتنەوەی شانۆگەریو

وەرزش و، کە شافەو تیپی گۆرانی لە سلێمانی بۆ جاری یەکەم دەستی پێ کرد لە ساڵانی926وە 927دا چیرۆکی تەمسیلی لەسەر شانۆ بینراوە و بە پارەکۆکردنەوەی ئەو تەمسیلانەش یەکەم تیپی مۆسیقا دروست بوە و یەکەم؟ مۆسیقاش بە نۆتەو لەسەر رێی تازە کاک عبدالواحد کۆیی بوە کە ئەو حەلە نەفسەربوە و ئێستاش شوکر ماوە و وەك زانیومە؟ دائەنیشیٚ ئەو هونەرمەندە بەرێزەش کە لە و حەلەوە ئەی هێشت مەخشەڵەکە بکوژێتەوە هەتا چلەکان مامۆستامان فوئاد رشید بەکرە و خوالێ خۆشبوو عبدالواحد نوری و، حسێنی میرزا صالح و حمە پاشای ئەورەحمان ئاغا و کریم زانستی و ئەبوبەکری شێخ جەلال و ئینجا ئێمە لە 946و947داو برادەرانی کەو هەتا ئێستا.

مێژووی رەسم و نیگاریش را کاک عەتا قەزاز و جەمال بەختیار خەریکن ئەوی پێویستیشمان پێیەتی بۆ تەواو کردن و دەوڵەمەند تر کردنی ئەم مێژووە ئەوەیەکە برایان مصطفی صائب وە کاک عبدالواحد وە کاک کەریم زانستی ببینێ و بیرەوەری ئەوانیش لەم بارەیەوە وەربگرین و لەگەڵ بیرەوەری هەندێ لە رووناک بیرانی ئەو حەلەش ئینجا سەر لە نوێ زنجیرە نوسینەکە دابرێژمەوە و بیهێنم هەتائێستا ئەمە بە کورتی ئەوەی هەیە لەو بارەیەوە.

***: مامۆستا ژیانی هونەریت لەچ ساڵێکەوە دەستی پێ کردوە؟ وە یەکەم بەرهەمی هونەریت چی بو کە پێشکەشت کردبێت؟**

—: هەر لە منالییەوە پێش ئەوەی بچمە قوتابخانە حەزم لە هەموو هونەرێك ئەکرد، گۆرانیم ئەوت، لەکۆلانا تەمسیلمان ئەکرد. بەلام لە ساڵی1935دا لە قوتابخانەی فەیسەڵیەوە بۆ جاری یەکەم و لەسەر دەستی مامۆستا رشید و حمە پاشادا یەکەم دەورم بینی بەسەر کەوتویی. یەکەم ئاوازی گۆرانیم تا دەست لە مل هیوانەکەم لە ساڵی 942دا، یەکەم دەوریش لە چیرۆکی شانۆییدا دەوری شێرزادی کوڕی سەرکردەی باڵقان بو لە چیرۆکی لەرێی نیشتمان، لە ئێستگەی بەشی کوردیشەوە سەدان چیرۆکی تەمسیلی نیو سەعاتی لە ساڵانی 1951تا1956.

***: مامۆستا بەرای بەڕێزتان ئایا شانۆگەری کوردی دوا کەوتوە یاخود نە، گەر دواکەوتوە بەچی پێش ئەخرێ؟**

—: بە تەنیا شانۆگەری نا، بەڵکو هونەر و ئەدەب، هەموباریکی ژیانی کوردەواری لەباوەش دوا کەوتوییدا نوقمە. بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە کە هیچمان نی‌یە، کە هونەر و ئەدەبمان نییە.

بۆ وەرامی ئەوەی کە بەچی پێش ئەخرێ، هەتا بڵێی زۆرن ئەو هۆیانەی ئەبنە بنکەیەکی پتەو بۆ پێشکەوتن لە هەموورویەکەوە، خەڵکی ئەڵێن ئەبونی شانۆ، ئەبونی چیرۆکی شانۆ ئەبونی پشتگیری و بێ دارایی و قوتابخانەی هونەری و چاپەمەنی هونەری و بەشدار نەبونی ئافرەت! دەمن ئەڵێم ئەمانە هەمووی ئەوسەری دواکەوتویی، ماکی دواکەوتن لە هەموشتێکدا وا لە دوا کەوتنی کۆمەڵگا کەخۆیدا، ئەبێ باری ئابوری بگۆڕێ، ئەبێ باوەڕی عشایەرگەری لە ناوا نەمێنێ، ئەبێ کۆمەڵگا بەپێوەرا وەستابێ، ئەبێ کاروبارمان تێکرایی بەدەستی زاناو دڵسۆز و لێهاتو ئەمێنەوە بێ کە بەپێرەوی زانستی‌یانەو هاوچەرخی یانە بەرەو ئەو پێشکەوتن و شارستانیە برۆین کە خەڵکی دەمێکە وان لە مەنزڵگاکەیا.

بەبێ گۆرانی هۆی بەروبوم بیروباوەر ناگۆڕێ، بەبێ ئەگۆڕانی بیروباوەڕ نە ئەدەب و نە هونەرو نە هیچ کردارێکی زانیاری ئەو گەشەیە ناکات کە لەناو میللەتانی کەدا کردویەتی. کە گۆڕاین شانۆش دروست ئەکرێ و قوتابخانەی هونەریش ئەبێ و هونەرمەندو ئەدیبیش و هەموو کەرەسەو توانایەك زۆر و ئافرەتیش ئەوەندە زۆر ئەبێ لە ناوسەدا پێنجیان هەڵ نابژێرێ بۆ دەور وەرگرتن و، مەسەلە کە بەپێوەوەستانی میللەتە، گۆڕانی کۆمەڵگاکەیە و تەواو.

***: بەوپێ‌یەی کە سەرۆکی کۆمەڵی هونەر و وێژەی کوردیت لە بەغدا ئایا کۆمەڵەکە هەتا ئێستاچی پێشکەش کردوە بەهاو وڵاتی‌یەکان؟**

—: کۆمەڵەکەمان، یان لقی کۆمەڵەکەمان لە بەغدا هەروا دوومانگێکە دامەزراوە و زۆربەی زۆری ئەندامان کە نزیکەی(70) ئەندامێك ئەبن قوتابین لە کۆلێجەکانی زانکۆی بەغدا و مستنصریە. پارەمان نییە، جێوڕێمان نییە، لە ژوورێکی پچکۆلانەی یەکێتی قوتابیانی کوردستانا لەوەزیری‌یە وەك کۆچەر هەڵماندراوە و لێرەوە دەستمان پێکردوە، دوا بۆجەی پارەمان نزیکەی شەش دینارێکە کەجێوڕێ ئەبو، کە پارە ئەبو کەبەریەرەکانێش کرای بێگومان ماوەی بەروبومیشت کە متر ئەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا پرۆگرامێکی نیوسەعاتی هەفتانە لە ئێستگەی بەشی کوردی، پرۆگرامێکی نیوسەعاتی پانزە رۆژجارێك لە تەلەفیزیۆنی کەرکوکەوە پێش کەش ئەکەین و هەتا ئێستا پێنج پرۆگرامی ئێستگەو سێ پرۆگرامی تەلەفیزیۆنیمان پێشکەش کردوە کۆڕێکی سێ سەعاتیمان بۆ هۆنراوەی تازەی کوردی و ڕەخنەلێ گرتنی پێك هێنا لە هۆڵی ساطع الحصری هەشت شاعیری تازەی لاو بەرهەمی خۆیانیان تیا پێش کەش کرد. ئەوەی کە دیارە ئەمەیە کە باسماوە کرد ئەوی دیاریش نییەو ئەخشەی بۆکێشراوە و لیژنەی بۆدانراوە بابمێنێ بۆ کاتی خۆی و شتێك نەڵێن کە هێشتا هاووڵاتیان سودیان لێنەدیوە.

***: لەبارەی هۆنراوەوە وەکو بیستومانە دەستێکی باڵات هەیە... ئایاراستە یاخود نە، ئەتوانی پارچە هۆنراوەیەکی خۆتمان بۆ بخوێنیتەوە؟**

—: من هۆنەرنیم و دەستیشم تیایا باڵانییە. بەلام لەبەر ئەوەی زۆر حەز لە هۆنراوەی باش و جوان ئەکەم و باشیان ئەخوێنمەوە خەڵکی واتێگەیشتوە کە من هۆنەرم لە بیرەوەریە هونەرییەکانما نوسیومەکە تەنیا یەك هۆنراوەم هەیە و بەس، ئەویش لە ساڵی1941دا بو بە گۆرانی کە ئەڵێ:

روخسارو روت گرژمەکە برا هەژارمکەم
رۆژی شادی نزیکە بۆ وڵات و شارمکەم

***: ئایا 6 ئێستا بەرهەمی چاپکراوت هەیە و چی‌یە؟**

—: دوو چیرۆکی تەمسیلیم چاپکردوە و خۆشم نوسخەم نەماوە لێیان؟ یەکەمیان بەشێوەی شارەزوریانە بو بە ناوی لام وایە (دەردی کۆمەڵایەتی)بێ، دووەمیان هی تۆلستۆی بو بە ناوی هێزی تاریکی لە ساڵانی51و52 یان 53دا؟ لە بەغدا چاپم کردن و دانەم فرۆشت بە(10)فلس و ئیتر جگە لە وتاری ناو رۆژنامە کوردییەکان زیاتر هیچم نییەو وابەخێرێ تازە خەریکم ئەگەرێم بە شوێن نوسینەکانماو کۆیان ئەکەمەوە بەو نیازەی ئەگەر گەیشتم و توانیم چاپیان ئەکەم.

***: بەم بۆنەیەوە تکات لێ ئەکەین پارچە هۆنراوەیەکمان بە دەنگی خۆت بۆ بخوێنەرەوە؟**

—: تازەترین پارچە هۆنراوەیەك کە بەدەستمەوە بێت بۆ ئاواز دانانی ئەم پارچە هۆنراوەیەی کاک جەلالی میرزا کەریمە بە ناوی(کاتێ جێم دێڵی).

گیانە ئەڕۆی! چزەی موژگانی چاوانتم بۆ جێ بێڵە
گیانە ئەڕۆی! هەناسەی پڕلە ئاگری سیەکانتم بۆجێ بێڵە
پڕ بە پڕی دو گۆمی چاو گریانتم بۆ جێ بێڵە
تەمەنی مەرگ سزاو ئازار گوڵی ژانتم بۆجێ بێڵە
من باخێکی بێ رەنگ و بۆم مزگەی پەڵەی بە هاری نوێی بارانتم بۆ جێ بێڵە
من زستانێکی بێ پشکۆم ئاگردانی قسەوباسی لێوەکانتم بۆ جێ بێڵە
من دڵدارێکی ڕەنجەرۆم خۆشەویستی و سۆزی دڵی پەنهانتم بۆ جێ بهێڵە

من شیعرێکی نەوترام هەست و رازی شاعیرێکم بۆ جێ بێڵە
من دڵێکی نەگۆڕراوم یەك دوو وشەی دڵسۆزێکم بۆ جێ بێڵە
من حەز نەکەم جێم نەهێڵی... جێم نەهێڵی
گەرجێم دێڵی... گیانە... خۆتم بۆ جێ بێڵە
من حەز نەکەم رووبار هەڵچێ.... شەقام هەڵسێ
جارێکی تر گولاڵەی ژان، لەناو باخی دڵی خەڵکی ترا بڕوێ
هەموو ڕۆژێ شاعیرێکمان لێ بکوژرێ

بەڵام گیانە... قەت حەزناکەم تۆجێم بێڵی
بڕوای شیعرم، خۆشەویستیم
بەگاسنی یەك دوعاخوازی بکێڵی

## پەراوێز

پێدەچێت ئەم چارپێکەوتنە ڕادیۆیی بێت



# ڕووناکی مۆمێك تاریکی ژورێك دەڕەوێنێتەوە

عومەر عەلی ئەمین

هەڵسەنگاندنی هونەرمەند بەراسگۆیانە، بەیارمەتیەك دەزانم بۆ بزرووتنەوە هونەرییەکە، کە ڕەفیق چالاکیش وەکو هونەرمەندێك هەڵدەسەنگێنرێت، بەشایستەی خۆی دەزانم، ئەمەش لەروانگەی یەك هونەرەوە نا، بە ڵکو شوێنەوارەکانی لە چەند هونەرێکدا دیارو ئاشکرایە، کەلە سالأنی پەنجاکانەوە تیایاندا دەستبەکار بووە و ماوەیەك لە"کۆمەڵی هونەرەجوانەکاندا" کاری کردووە.

ڕەفیق چالاکی خوالێخۆشبوو کە لە بواری هونەری مۆسیقادا گۆرانی دەووت، من ئەوەم پێوەنەدەبینی: بۆ یە گۆرانی دەڵێت کە خەڵکی بڵێن گۆرانیبێژە، یان دەنگ خۆشە ئەو گۆرانی بۆ خەڵکی نەدەووت بەڵکو بۆ خۆی دەوت. هەستت پێدەکرد ئەو گۆرانیانە لە ناخیەوە دەهاتنەدەرەوە، سۆز و جۆشێکی تایبەتی خوودی خۆی لەگەڵ بوو، هەروەك قسەت لەگەڵ بکات ئاوها کاری دەکرد.

کە گۆرانیەکە لە بارەی دڵداریەوە بوایە، سۆزەکانی دڵی گوێ ڕاگری دەهێنایە جۆش، کە لە بارەی جوانیەوە بوایە، تەلیسمی جوانیی دەهەژاند، کە باسی یادەوەری بوایە، یادەکانی رابوردووی زیندو دەکردەوە و دەیوروژاند گۆرانیەکانی:(قژکاڵی لێوئاڵی و دوو ئاوانەکەو خاڵەی ڕێبوار.... تاد) شاهیدی ئەم راستیانەن ڕەفیق کە بیویستایە گۆرانی بڵێت، پەڵپی باندی موسیقای نەدەگرت.. لە بە هاری1947دا کە لە قوتابخانەی ناوەندی کچان لای مزگەوتی گەورەوە پێشانگەیەکی شێوەکاری گشتی کرایەوە بو قوتابخانەکانی سلێمانی، من و ئەو هەریەکەمان سەرەوکاری ڕێکخستنی بەرهەمەکانی قوتابخانەکەی خۆمان ئەکرد، نیوەرۆیەکیان کە قوتابخانە چۆڵ بوو بۆ حەوانەوە چووینە ژوورێکەوە، ئەویش لەسەر قەنەفەیەك چوارمشقی لێی دانیشت وەك بلاوێنێتەوە بەدەنگە تایبەتیەکەی خۆی دەستی پێکرد، هەموومانی هەر بەنجکرد، بە جۆرێکیش کە هیچ کەس بیری لەوە نەکردەوە کە ئەم گۆرانیە، بێ مۆسیقایی پێوە دیارە، هەر وەك زۆربەی جارانی تری، کەلەم پێڕەوەدا لەگەڵ خوالێخۆشبوو حەمە ساڵح دیلاندا دەچوونەوە سەر یەکتر.

ڕەفیق کە گۆرانی ئەووت وەکو دەنگ خۆش، دەنگ خۆش نەبوو، بەڵام هونەرەکەی زۆرتر لە چۆنێتی وتنەکەیدابوو، تۆن و کالأی ئاوازەکانیانی بە سازگاری دەردەبڕی، کە بەم پێیە جۆرە تایبەتمەندێتیەکی بۆ دەنگەکەی خۆی دروست کردبوو، بەتێبینی من چۆنێتی گۆرانی ووتنی(ڕەفیق چالاك) و(عبدالحلیم حافظ) لە یەکترەوە دوورنین.

لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانیدا کە ڕەفیق لەگەڵ مامۆستا "گۆران"ی شاعیر و مامۆستا ڕەمزی قەزازی نووسەردا بەیەکەوە لە رادیۆی شەرقی ئەدنا کاریان دەکرد، لەو رۆژگارە گرانی و قات و قڕیەدا، کە گۆرانی(دەنکە گەنم)ی شیعرەکەی گۆرانی لە گەروی ئەو رادیۆیەوە بە گۆرانی دەپرژاند، کۆڵێك سەبووری دەدا و دڵی ئەکردەوە، یان کە سروودی(کوردستانی جوان)ی، ئەچڕی شانازیەکی دەبەخشی و ئەو گۆرانیانەی هەر لە یاددا ئەمێننەوە.

یان کە گۆرانی(ئارامی ئارامی گیانم)ی لە رادێوی ئەوسای بەغدادەوە بۆ دەوتین، لەسەر باڵی تێڕامانەکانمان ئەیبردینەوە بۆ کەش و هەواکەی رابوردوومان... چەندان شەوانی هاوینی سەرەتای شەستەکان کە لە گەڕەکی سابونکەران دەچوومە سەربان بۆ نووستن، تازە ئەو لە یانەی فەرمانبەرانەوە دەستی دەکرد بە گۆرانی وتن و شنەبای شەو دەیهێناو دەیدا بە گوێمدا و خەوی لێ دەخستم.

ڕەفیق هەر لە گۆرانی و ئاوازدا ناوبانگی دەرنەکردبوو، بەڵکوکە ناوی دەبرێت، خەڵکی، شانۆو نواندنیان بیردەکەوێتەوە کە دەچووە سەرشانۆکەو دەوری نواندنی پێشکەش دەکرد، بینەر وای دەزانی کە ئەم کوڕە بەشێکی تەمەنی لەو هونەرەدا بردۆتە سەر، بەڵکو زمانی حاڵیشی وای دەگەیاند کە ئەو بەو مەبەستە نواندن پێشکەش ناکات هەتا خەڵکی بڵێن ئەکتەری چاکەو، بۆ خەڵکی نواندنی پێشکەش نەدەکرد، بەڵکو بۆ خوودی خۆی و خۆزگەو خواستەکانی دەروونی خۆی کە ئەم شێوەیە لە ڕێبازەکەی ستانسلافسکیدا پێی دەووترێت(نواندنی راستگۆ) بۆ نموونە، کە لەسەر شانۆکە کەسێکی خۆپەرستی رسوابکردایە، بەدەر لە سنووری دەقی شانۆنامەکە، خۆشی گەلێك ڕەخنەو تانووتی تریشی بە سەردا دەباران، هەر چەندە یاسای شانۆ ڕێگە بەمەش نادات.

(شانۆیی پیسکەی تەڕپیرو، بووکی ژێردەواری رەش و، ئەوینی نیشتمان و....) دراماکانی رادیۆی بەغدا شاهیدی ئەم راستیەن.

ئەوەی شایانی باسە، عونسورەکانی دەنگ و دەم و زمان و باڵاو زیرەکی و جم و جووڵ لەسەر شانۆکە گەلێك یارمەتی ڕەفیقیان دەدا کە لەدەوری نواندنەکانیدا دیار و بەرچاوبێت، دەنا لەساڵی 1971دا کە لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی تردا بانگی کردم بۆ بەشداری شانۆیی (دکتۆری تێلا) لە هۆڵی (موستەنسریە) لەبەغداد، کە بۆ یەکەم جار لەگەڵی چومە سەر شانۆکە، بۆم دەرکەوت کە ئەوپیاوە لەگەڵ زانستی شانۆونواندندا ئاشنایەتی کەمتر هەیە، چونکە لەمیزانینی دایەلۆج و جم و جووڵەکانیدا سەربەستی زۆری دەدا بەخۆی، کە بەمەش دەوری ئەکتەرەکانی تر گۆج دەبوو هەروەها بەزیان دەشکایەوە بەسەر وێنەی گشتیی نمایشەکەدا و، کاری دەکردە سەر ڕەوتی گشتی شانۆییەکە.

کەواتە ئەم هەموو ستایش و پیاهەڵدانەی پێشترمان، تۆ بڵێیت جێی خۆیاندا نەبوون؟ بەڵێ. بەڵام ڕەفیق شوێنەواری ئەو ڕەخنانەی بەدەنگە دلێرە شانۆییەکەی و ڕەوان بێژی و، دەم و زمانەکەی و، جۆری ئیلقا و زیرەکی و، باڵاکەی، بەجۆرێك پڕدەکردەوە، کە بینەر بیریان لێنەکاتەوە.

کۆتایی سەرنج و تێبینیەکانم بەوەدەهێنم: بەکورتی ئەوەی کە لە بەرهەمە هونەرییەکانی خوالێخۆشبوو بەدی دەکرا، بەگشتی جوان و پەسەند بوون و، کەسێك نەبینرا کە ناوچەوانیان لێگرژ بکات، چ لە گۆرانی و چ لە شانۆییەکانیدا.

ئەڵێت "ڕوناکی مۆمێك تاریکی ژوورێك دەرەوێنێتەوە" ئەگەر ئەو هونەرمەندە توانا و بەهرەکانی تەمەنی خۆی، تەرخان بکردایە بۆ خەم خواردنی هونەری گۆرانی و مۆسیقا و شانۆ، گەلێك لە بەختانی هونەری وڵاتەکەمان دەبوو.

وتاره شیعر

# گوڵە شەست پەڕی بەهرە (ڕەفیق چالاك)

شێرکۆ بێکەس

ئەو کاتە من حەڤدە بەهاری چاو فرمێسکاویی بووم
حەڤدە سیا ساڵ و حەڤدە کازیوەی تەماویی
هەرزەکارێکی سەروقژ بژی لانەوازی
یێخەی کراس چرچ و لۆچی سک تێك قوپاو
تازە بە تازە چاوبرکێم لەگەڵ کچی شیعردا ئەکرد و
خەونم بە "جوانی بێ ناوی" گۆران و
پێغەمبەری "جوبران" و
گۆمەکەی "لامارتین"ە وە ئەبینی
کە ئەوم ناسیی بۆ یەکەم جار
لەسەر تەختەی شانۆو لە ماڵی "پیسکەی تەڕپیری"
"مۆلێر"دا بەیەکتر گەیشتین..
ئێمە بنچك و لەو دارتوویەکی پڕ
ئێمە تازە لە باڵەفرێداو
ئەو دەوران دەوری شەقژنی بوو
وتیان: ئەوەتا "ڕەفیق چالاك"!
پیاوێکی ئەسمەری قیت و زیت.. دار زەیتون بوو.
لەشێکی باریك و سووك و بزۆز... ئاسك بوو ئاسك.
تەوێڵ پان و چاوشینێکی بریسکەداری درەوشاوە
وەك دوو کوژەکەی بەرخۆر
قژ کورت، بە دووکەڵی جگەرە
ناوەندی پەنجەکان زەرد زەرد
جێ بەخۆنەگر، بەدەم وپل و قسەدانار دانار.
لەرەی دەنگێکی سیحراویی کاریگەر
کە گوێگری ئەخستە ژێر ڕکێفی
خۆیەوە و متی ئەکرد...
وەك لەو دەنگەدا جادووگەرێ هەبێ
وەك لەو گەرووەدا
ژێیەکی ئەفسوناویی هەبێ..
وزەیەکی ماندوو نەبووی
هەمیشە سەماکەر وەك
ئاگرێکی بە کڵپەو بڵێسە
سەماکەر.. وەك قەڵبەزەی شەتاو
ئاڕووشە.. وەك سمۆرەی نێوان پەل وپۆی داران.
دەم و دوویەکی نەپساوەی تێکەڵ بە گاڵتەجاڕی و
پێکەنینێکی بەرز و سەرێك وەك بەهەرچواردەوردا
بسووڕێتەوە وابوو..، بەر لە چەند ساڵ:
ئەسپی "سیاسەت" گلاندبووی

لەو پەیژەیەوە کەوتبووە خوارێ و
زامەکان لە هەناویا هەر داگیرساوبوون و
بەلەشی یادگارەکانیەوە هەر مابوونەوە..
بەڵام ئەو لەئەسپێ زیاتری هەبوو
لە پەیژەیەك زیاتری هەبوو
لە ڕێگایەك زیاتری هەبوو
لە پەیامێکیش زیاتری هەبوو..
ئەو قەڵەمەکەی ئەسپێکی کەحێلەی
چوارپەل سپی‌بوو، چوارپەل ئاگر..
لە دەمی ئەو قەڵەمەوە ئاوێکی ڕەوان، بێ گرێ وگوڵ،
ئەڕژایە ناو جۆگەی بەهرە و داهێنانەوە.
پلووسکی کۆساران بوو، ئەو قەڵەمە.
وشەکانی مێوژە ڕەشکەو
تامیان وەك باسووق و گەزۆو
خۆشاوی‌کوردەواری وابوو.
کە ئەینووسی ئەتوت:
دەرگەزێنی "سلەیمانی" بەگوێیدا ئەچرپێنێو
"مامەیارە" لە تەکیایەو
"ئەحەی کوڕنوو" شتی لەهێنێتەوە بیرو
"گۆیژە" لە سیحری چیرۆك و مێژووی
خۆی پێ ئەبەخشێ.
چەندین زنەی بەهرە لەو سەرەوە هەڵ ئەقوڵێن.
درەختێکی تەلیسماویی بوو!
لەیەك کاتدا سێوەلاسوورەی پەخشان و
هێشووەترێی ڕەزی دەنك خۆشیو
گوڵەلاولاوی نواندن و
گوڵەبەڕۆژەی ڕۆژنامەنووسیی ئەگرت.
لە یەك کاتدا.. خوڕەی چەم و، قاسپەی قەدپاڵ و
ڕەنگی ئاسۆ، شەپۆلی چیرۆك و
بۆنی مێخەك بەندی کچی دڵدار و
شەماڵی بەردەم مایکرۆفۆن بوو.
ئەوەندەی گلۆڵە بڵێسەیەك.. وریا بوو.
ئەوەندەی لاوك گەرم بوو
ئەوەندەی حەیران نیان بوو
هێندەی مامزێکی چاوشینیش سرك بوو
لە سەروەدەمێکدا کە ئەم شارە هێشتا
وەك کیژی شەرمنۆك.. لە بەردەم هونەرداو

لەسەرشانۆ بە ماتماتوولەوە.. نزیکی:
ئازادی ژن و سەربەستی ڕەخنە ئەکەوتەوە
نزیکی ژیانی داهێنان و سنوور بەزاندن ئەکەوتەوە
ئەو چالاکانە هات و چارشێوی
دەم و چاوی شانۆی لاداو پەنجەی کرد بەچاوی
تاریکیی کۆمەڵایەتیداو
مۆمی لە ناو و یژدان و
لەسەر ناوچەوانی ئەو تەختە پیرۆزە
داگیرساند..
چالاکانە هات و بوو بە
سروودی ڕاپەڕین.
چالاکانە هات و بوو بە
گۆرانی کۆڕی ئازیزان و تێکەڵ بە دوو ئاوان بوو.
ئەسپی سیاسەت گلاندی
بەڵام ئەسپی هونەری جڵەوکردەوە
سواری ئەسپی شانۆ بۆوە..
چووە سەر باڵەکانی هەڵۆی سرودو
زەنگی ڕۆژنامەنووسیی لێدایەوە
دانەماو، بیرنەچۆوە و، خامۆش نەبۆوە.
پەنجەرەیەکی لێ گیراو دەپەنجەرەی تری کردەوە
ڕێگەیەکی بزرکرد بەڵام چەندین ڕێگەی تری دۆزییەوە
چالاک.. یەک کڵاوڕۆژنە نەبوو، یەک باخ نەبوو
یەک سەرچاوە نەبوو، یەک بەهرەیش نەبوو.
چالاک.. دەنگ و ڕەنگ وبۆن و بەرامەی
وڵاتی هونەر و نیشتمانی جوانکاری و
سەلیقەی پڕ لە وردەکاریی بوو.
زەنگیانە بوو، ژێی کەمانچەو، وشەی پاراوو
سروودی ئاگراویی‌و، ئەکتەرێکی زگماکەو، خەتیبێکی
هەژێنەروو، قورگێکی تەلیسماوی بوو.
لە "گەلاوێژ" و لە "زەنگی کاروانی پەیام"و
لە لاپەڕەکانی "برایی‌و برایەتی"یش دا
ئەستێرە بوو..
کۆڕێک ئەوی تیا بووبێ ،، بەردەوام گەرم بووە.
بەردەوام پڕ لە هاژەی پێکەنین بوو،.
هەر "سیاسەتیش".. پاڵەوانی خۆی نی‌یە.
هەر "حیزبایەتیش".. شەهیدی خۆی نی‌یە.
کوردستانی شانۆو، نیشتمانی هونەرو، چیای گۆرانیی‌و
جیهانی ڕۆژنامەنووسی‌و، زەریای زمانەوانیش
شەهیدانی خۆیان هەیە،،
مۆمی خۆیان هەیە
ڕابەری خۆیان هەیە
بۆیە بەدڵنیاییەوە ئەڵێم:
"ڕەفیق چالاک": لە مێژووی سەوزی هونەری کورددا:
دار سنەوبەرێکی هەمیشە زیندووی ئێمەیە،
قومریەکی چاوشینی وڵاتی گۆرانیی ئێمەیە
زەنگێکی شانۆی ئێمەو
ئاگردانێکی ژووری کەلەپوورو و
طاوسێکی ڕەنگینی بەهرەو
قەڵەمێکی دەم بەگزنگی زمانی کوردی‌و
گەروویەکی زێڕینی سروودی
نەتەوەیی‌و نیشتمانیی
ئەم کوردستانەیە.

ماتماتوولە: حەزەر

**هەولێر**

# رەفیق چالاک ئاوێتەی ئەوینی هونەر

ئیبراهیم سەعید فەتحوڵڵا

رۆژی30/11/1998 (25) ساڵ تێپەڕی بەسەر کۆچی دوایی مامۆستاو هونەرمەندو تێکۆشەر(رەفیق چالاک) ئەو هونەرمەندە گەورەیەی لە بواری کارکردنیدا سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەست هێناو توانی بەبەرگێکی قەشەنگەوە بچێتە مەیدان و گروتینێکی نوێ بەهونەری کوردی ببەخشێ جاچ وەك گۆرانی بێژێکی دەنگ زوڵاڵ، یان، ئەکتەرێکی سەرکەوتو یا وەرگێڕێکی بەسەلیقە.

کارە شانۆییە سەرکەوتووەکانی(گلکۆی تازەی لەیل، پیسکەی تەپڕیپ، بووکی ژێر دەواری رەش، خەسووە یا ئەژدیها، دکتۆری دێم) و گۆرانی و سروودە بە سۆزەکانی(بڵێین بەیار و بەنوری بادەو لەبەرنازی چاوبازان و هەی ناروجەژنە جەژنی کوردستان) و دەیان کاری هونەری سەرکەوتووی دیکە.

ئێستاش دوای چارەکە سەدەیەك بەسەر کۆچی ئەو هونەرمەندە گەورەیەدا سەرلە نوێ هەوڵ و ماندوویی و کارە هونەرییەکانی دێتەوە یاد کە تامەتایە لە یاد ناچێ و وەك شاکارێکی گەورەی هونەری جێی خۆی لەدڵی هەموماندا کردۆتەوە.

(رەفیق چالاك) وەك هونەرمەندێکی لێهاتوو بەتوانا توانی لە زۆر بواردا جێی خۆی بکاتەوە و ژیرانە جێپەنجەی خۆی بنەخشێنێ بەشێوەیەك دەستی بدایاتە هەچ کارێك سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەست ئەهێناو ئەبووە جێی رەزامەندی هەموو لایەك، لێرەدا تەنها ئاماژە ئەکەین بەرۆڵی گەورەی مامۆستا چالاك لەسێ بواردا(شانۆ-گۆرانی وئاوازدانان-راگەیاندن و کاری رادیۆیی). بەو هیوایەی بتوانین کەمێك لەبەرزی ئەو مرۆڤە بهێنینەوە یاد.

## شانۆ... چالاك ئەکتەر و دەرهێنەر و نووسەر و وەرگێڕ

(رەفیق چالاك) هەر لە سەرەتای منداڵییەوە خولیای هونەربووە و کارە هونەرییەکانی ناوەڕاستی ساڵانی بیست سەرنجیان راکێشاوە بەتایبەت بەرهەمە هونەرییەکانی هونەرمەندی پێشڕەوی شانۆی کوردی مامۆستا(فوئاد رەشید بەکر)، لە تەمەنی(12)ساڵیشدا بۆ یەکەم جار چۆتە سەر شانۆ لەگەڵ کۆمەڵێ هاوڕێی خۆیدا لە قوتابخانەی فەیصەڵیەی شاری سلێمانی شانۆگەرییەکیان پێشکەش کردووە. ئیدی چالاك بەسەلیقەیی و تواناو خۆی توانی زۆر لەو بوارەدا قوڵبێتەوە و توانی چەندین بەرهەمی شانۆیی سەرکەوتوو پێشکەش بکا.

یەکێك لەو شانۆگەرییە سەرکەوتووانەی کە بەدەستپێکی کارە سەرکەوتووەکانی دائەنرێ، شانۆگەری(لەرێی نیشتمان) بوو کە ساڵی1946دا لە سلێمانی نمایش کرا بۆ یارمەتی دانی قوربانییانی بومەلەرزەکەی ئەو ساڵی(پێنجوین)(چالاك) ئەو شانۆگەرییەی بەدەقێکی نووسەری بەناوبانگی فەرەنسی(فرانسۆ کۆپێ) وەرگرتبوو کە ؟ بەبەرگێکی کوردیەوە پێشکەشی بکاو بیخاتە سەر تەختەی شانۆو ئەرکی دەرهێنانی خستە ئەستۆی خۆی و لە ماوەی(7)رۆژی کارکردنیدا توانی (2)هەزار دینار کۆبکاتەوە کە هەمووی تەرخان کرا بۆ یارمەتی دانی قوربانیانی بومەلەرزەکەو دواتر هەمان شانۆگەری لە پێنجوێن و هەولێر نمایش کرا کە ئەمەش یەکەم جاربوو لە بزووتنەوەی هونەری کوردیدا تیپێکی شانۆیی لە شارێکەوە بچێت بۆ شارێکی دیکە بۆ نمایشکردنی شانۆگەرییەك بەهەمان شێوە لە کاتێکدا سەرۆکی کۆمەڵی هونەرجوانەکان بووە، چالاك توانی چەندین بەرهەمی شانۆیی پێشکەش بکا، لێرەدا هەندێ لەو بەرهەمە شانۆییانە بە نموونە دەهێنینەوە:

*بوکسی ژێردەواری رەش: ئامادەکردن و دەرهێنان و دەوری ئەکتەری سەرەکی(رەفیق چالاك).

*دیمەنی کومیدی(خەسووە یا ئەژدیها) نووسین و دەرهێنان و دەوری سەرەکی (رەفیق چالاك).

*پیسکەی تەپڕیپ: گۆڕین و ئامادەکردنی (رەفیق چالاك) و دەوری وەشتی ودەرهێنان و نواندنی(رەفیق چالاك).

ئەو نموونانەی ئاماژەمان بۆکردن تەنها مشتێك بوون لە خەروارێك و چالاك توانی چەندین کاری شانۆیی سەرکەوتووی دیکە نمایش بکاو لەماوەی کارکردنیشیدا گڕوتینێکی زۆری دایە بزوتنەوەی هونەری شانۆیی و هەنگاوی گەورەی نا بۆ زیاتر برەودان بەو بوارە:

## چالاك... هونەرمەندێکی دەنگ خۆش و ئاواز دانەرێکی بە توانا )

بۆ یەکەم جار کە (رەفیق چالاك) گوێی لە مۆسیقا بووە زۆر منداڵبووە کاتێك تیپێکی کەشافە بە باندی مۆسیقاوە بەسەر شەقامەکانی سلیمانیدا گەڕاون، چالاك هەر لەو سەردەمەوە شەیدای گۆرانی وسروونە کوردیەکان بووەو هەوڵی داوە لەوبوارەدا خزمەت بکا بۆیە کاتێك لەسەرەتای ساڵانی(چل)دا بوو بەمامۆستا دەستی کرد بەزیندوکردنەوە وبلاوکردنەوەی سروودە کوردیەکان هەوڵی زۆریدا لە ناو نەچن و لە قوتابخانەکاندا بوترێتەوە، بۆ یەکەم جاریش کە ئاوازی داناوە ئاوازی بۆ شیعرێکی مامۆستا زێوەر داناوە بە ناونیشانی(تا دەست لەمل هیوانەکەم) لەماوەی ژیانیشیدا ئاوازی بۆ زیاتر لە(20)سروود داناوە کە تا ئێستا لە قوتابخانەو ئێزگەکاندا دەوترێنەوە و وەك کارێکی هونەری رەسەن هەرگیز لە یادناچن.

هەرچەندە مامۆستا چالاك لە هیچ ئامێرێکی مۆسیقای نەدەزانی بەڵام کاتێك کە شیعر کارتێدەکرد و دەیجوڵان راستەوخۆ ئاوازێکی نموونەیی بۆ دادەناو دواتر ئەبووە جێی رەزامەندی هەموولایەك، تەنانەت شارەزاو پسپۆڕانی مۆسیقاش ئەو ئاوازانەیان زۆر لا خۆش بووە کە ئێستا رەنگدانەوەی خۆیان هەیە و جێی خۆیان لە ناو گۆرانییە کوردییە رەسەنەکاندا کردۆتەوە.

## چالاك... بلیمەتی بواری راگەیاندن و کاری رادیۆیی

(رەفیق چالاك) وەك کەسێکی بەهرەدار و لێهاتوو لەساڵی 1942دا لەلایەن کۆمەڵەی هیواوە هەڵبژێرا بۆ ئەوەی لەگەڵ (عبداللە گۆران)و (رەمزی قەزاز)دا بچنە فەلەستین و لە

(یافا) بەشی کوردی رادیۆی(الشرق الادنی) بکەنەوە ئیدی(چالاك) زۆر سەرکەوتووانە توانی لە بواری کاری راگەیاندندا کار بکاو ئاشنایەت لەگەڵ چەندین هونەرمەندی عەرەبی گەورەی ئەو سەردەمەدا پەیدا کرد لەماوەی سێ ساڵی کارکردنیشیدا لە ئیزگەی (الشرق الاردنی) توانی خزمەتێکی باش بکاو جەماوەر و گوێگرێکی زۆری بەلای خۆیدا راکێشاو لەگەڵ هاورێکانیدا چەندین بەرنامەو بابەتی بەسوودیان پێشکەش کرد. لە ماوەی شەش ساڵی کارکردنیشیدا لەبەشی کوردی ئیزگەی بەغدا چالاك توانی خزمەتێکی زۆر بکاو بەشی کوردی زۆر بەرەو پێشەوە بەرێت جاچ لەرووی زمانەوە بووبێت یان بەرنامەکان یان لەرووی گرنگی دان بەبواری ئەدەب و هونەری کوردی جگەلەوەی وەك بێژەرێکی سەرکەوتووش کاری دەکرد توانی بەهاریکاری کۆمەڵێ هاورێی هونەرمەندی تیپێکی تەمسیلی سەرکەوتوو دابمەزرێنێ کەبەرای هەموو شارەزایان و پسپۆرانی بواری هونەر ئەو تیپە توانی سەرکەوتنێکی باش بەدەست بهێنێ وگڕوتینێکی باش بداتە بنچینەی شانۆو درامای هاوچەرخی کوردی و لەماوەی شەش ساڵی کارکردنیدا نزیکەی(200)تەمسیلی هەفتانەی پێشکەش کرد جا چ لە نووسینی مامۆستا چالاك خۆی بووبێ یان وەرگێڕراوو ئامادەکراو یا نووسینی ئەندامانی تیپەکەی هەر ئەو تیپە تەمسیلییەش یەکەم تیپی رەسمی بوو لە ئیزگەی بەغداو بۆ یەکەم جاریش لە مێژووی هونەری کوردی و ئیزگەی کوردیدا یەکەم ئۆپەرێتی کوردی پێشکەش کرد بەناونیشانی ئۆپەرێتی (دڵداری کوڕەشوان).

بە هەمان شێوە(مامۆستا رەفیق چالاك چەندین و تاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و پەخشانی لە ئیزگەو رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا بڵاوکردۆتەوە و رۆڵی بەرچاوی هەبووە لە برەودان بە کاروانی رۆژنامەگەریی کوردی و بۆ ماوەیەکیش سەرپەرشتیاری چەند رۆژنامەیەك بووە وەك رۆژنامەی برا لە سلێمانی و رۆژنامەی برایەتی لە بەغدا لە ساڵانی1968یشەوە تا 1970 وەك بێژەرو نووسەری سیاسی لە ئیزگەی دەنگی کوردستانی عیراق بووە و ماوەیەکیش بۆتە لێپرسراوی ئەو ئیزگەیە.

هەرلێرەوە هەقی خۆیەتی ئاماژەی بۆبکرێ کە چالاك لە زۆربواری دیکەدا شۆرەسواری مەیدان بووە جاچ وەك مامۆستاو خەتیب و کوردەی زان و ئەدیب و هەتا دوایی... کە بەراستی شایستەی ئەوەیە بەدوورودرێژی ئاماژەی بۆبکرێ و رۆڵی چالاك لە هەموو ئەو بوارانەدا بەبەرز بنرخێنرێ.

# چەند پەیڤێك بۆ رەفیق چالاك-ی فرەبەهرە

چالاك... یەك کڵاو رۆژنە نەبوو، یەك باخ نەبوو، یەك سەرچاوە نەبوو، یەك بەهرەیش نەبوو، چالاك.. دەنگ و رەنگ و بۆن و بەرامەی وڵاتی هونەر و نیشتمانی جوانکاری و سەلیقەی وردەکاری بوو، زەنگیانەبوو، ژێی کەمانچەو وشەی پاراوو سرورودی ئاگراوی و ئەکتەرێکی زگماك و خەتیبێکی هەژێنەرو قورگێکی تەلیسماوی بوو.

**شێرکۆ بێکەس**

چالاك شانۆی کوردی بەرەو گۆڕین و داهێنان و نوێ کردنەوە برد و شانۆی کردە مەڵبەندی رووبەڕووبوونەوەی دوژمنان و لە بەرزی شانۆوە دەردو ئازاری گەلەکەی دەخستە روو.

**نوری وەشتی**

چالاك... ئەکتەرێکی لێهاتوو، دەنگ خۆشێکی بەسۆز، رۆشنبیرێکی بەتواناو خەتیبێکی نموونەیی‌بوو... بەراستی کوچی ئەو خەسارەتێکی گەورەبوو لە بزوتنەوەی روناکبیری بەگشتی و بزوتنەوەی هونەری بەتایبەتی.

**کاوەئەحمەد میرزا**

چالاك-ی هونەرمەندی گەورە و بەرێز یەکێکە لەو هونەرمەندانەی گەلەکەمان شانازی پێوە ئەکات و هەرگیزاوهەرگیز لە یاد ناچێت.

**کەریم کابان**

چالاك.... قوتابخانە بوو، دەریایەك بوو پڕ لە میهر و سۆز، تائێستاش شوێن پەنجەی دیارە، بەسەر بزوتنەوەی هونەری کوردی‌یەوە.... بەڕاستی من هەمیشە خۆم بەقوتابی و شوێن کەوتووی رێبازەکەی ئەو دەزانم چونکە ئەو مامۆستا و رێ پیشان دەربوو.

**حەمەی نێرگز**

چالاك.... هونەرمەند و ئەدیب و رۆشنبیرێکی هەڵکەوتووبوو هونەرەکەی سروشتی و خواکردە بوو هێندە بەسەلیقە و بەتوانا بوو دەستی بدایەتە هەرچ کارێك چالاکانە سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا و گرەوی خۆی دەبردەوە.

**ئەحمەد دەنگ گەورە**

چالاك-ی ئەکتەرو نووسەر و دراماتۆر هەروەك چۆن رۆڵی ئێجگار گەورەی هەبوو لەپێش خستنی شانۆدا، ئاوهاش توانی کەسایەتی هونەرمەند زیاتر بناسێنێ بە کۆمەڵی کوردەواری.

**یاسین قادر بەرزنجی**

## تادوامەناسەش پەیامەکەی خۆی بردەسەر

رەفیق چالاك-ی هونەرمەند هێندە ئالودە و هۆگری پەیامەکەی بوو کە نەی‌دەتوانی هەرگیز خۆی لێ جودا بکات و تا دوا هەناسەی ئاوازی بۆ جوانی و نیشتمان و ئەوەکانی دواڕۆژ دەچڕی، وەك دیاری‌یەکیش بەر لەمردنی شانۆگەریی (دکتۆر دێم)ی لەهۆڵی زانکۆی (موستەنسریە) لە بەغدا پێشکەش کرد کە دوا شانۆگەری خۆی بوو. لە مانگی حوزەیرانی 1973دا و بەر لەمردنی بەچەند مانگێك دوا گۆرانی خۆی بەناونیشانی (شوێن کەوتن) تۆمار کرد کە شیعری مستەفا بەگی کوردی بوو.

وەڵێ ئەفسوس دڵە گەورەکەی مامۆستا و هونەرمەند (رەفیق چالاك) لە 1973/11/30دا لەلێدان کەوت و بۆ دواجارماڵئاوایی لێکردین و لەدوای خۆی کۆڵێ عیشق و زامی بەجێ هێشت.... کۆڵی بیرەوەری و سەروەری.. کۆڵی پەیڤی جوانی ئەرخەوانی.

# دووشانۆگەری ساڵی1957 لە سلێمانی لە ئەرشیفی شانۆی کوردییەوە

یاسین قادر بەرزنجی

قۆناغی دووەمی شانۆی کوردیمان، کە ساڵانی نێوان پەنجاکان تا حەفتاکانە، قۆناغی زەمینە خۆش کردن و بەرەوپێشەوە چوونی بزووتنەوە شانۆییەکەمانە، چونکە لەم ماوەیەدا شانۆ درووست کراوە و هونەرمەندی بە توانای هەڵکەوتوو دەرکەوتوون و گەلێک شانۆگەریی کوردی و وەرگێڕراو بە شێوەیەکی هونەریی رێک و پێک پیشکەش کراون، لە هەمان کاتدا لە ماوەی ساڵانی پەنجابە دوواوە جەماوەر بە شێوەیەکی بەردەوام چوونەتە سەیری شانۆگەرییەکان و هانی ئەکتەرەکانیان داوە و بە چاوی پڕ لە رێزەوە تێیان ڕوانیوین.

لەو بەرهەمە بەپێزانەی لەو کاتەدا پێشکەش کراون و بینەران لایان پەسەند بووە، دووشانۆگەری بوون کە لەسەرەتای ساڵی1957دا لە لایەن قوتابیانی سانەویی سلێمانییەوە پێشکەش کراون، ئەو دوو شانۆگەرییەش(پیسکەی تەڕپیر و گڵکۆی تازەی لەیل) بوون، لەم باسەماندا بەدرێژی و لەگەڵێک لایەنی ئەو دووبەرهەمە ئەدوێین:

1- پیسکەی تەڕپیر:

ئەم شانۆگەرییە لە نووسینی نووسەری بەناوبانگی فەرەنسایی(مۆلیێر)ەو هونەرمەندان ڕەفیق چالاک و نوری وەشتی بەدەستکارییەوە کردوویانە بە کوردی و لەلایەن ڕەفیق چالاکەوە دەرهێنراوە و قوتابیان و یارمەتی دەرانیان و لیژنەکانی هونەری سانەویی سلێمانی کوڕان بۆ باربۆو دستگیرۆیی قوتابیانی هەژاری سانەوی پێشکەشیان کردووە.

ئەم شانۆگەرییە کە لە پێنج پەردەدا بووە بە جۆرێک ئامادەکراوە کە لەگەڵ واقیعی ژیانی کوردەواری خۆمانەوە نزیک بووە و بینەران چێژ و سوودێکی باشیان لێ وەرگرتووە. ئەم شانۆگەرییە کە لەگەڵ شانۆگەریی(گڵکۆی تازەی لەیل)دا پێکەوە نیشاندراون، لە سەرشانۆی سانەویی سلێمانی کوڕان پێشکەش کراون و ئەکتەرەکانی بریتی بوون لەم بەڕێزانە:-

ڕەفیق چالاک- دەوری میرزا مەحمود.
نوری وەشتی-سالار
سەلاح محەمەد جەمیل-پزشک.
کەمال ڕەشید موختار- گەلاوێژ
تەها خەلیل-باجی ئایشێ
یاسین خەلیل-دڵشاد
شیرکۆ فایەق-سەدیق بەگ
جیهان عومەر-ئەڵەکە
مەجید محەمەد-وەلەکە
عەبدوڵڵا محەمەد-مچە
بورهان کەریم مەسرەف-ئەبەرد
ئەمینی حاجی عارف-معاونی پۆلیس
کەمال حمید-باجی مەنیج

چیرۆکەکەش، باسی کابرایەکی پیرەمێردی پیسکەی چاوچنۆک ئەکات کە ژیانی خۆی و خێزانەکەی بە پارە پەرستی تێکداوە، کوڕەکەی دڵی ئەچێت بەکچێکدا، کەچی لە هەمان کاتدا پیسکە ئەیەوێت بۆ خۆی بهێنێت! هەروەها ئەیەوێت کچەکەشی بداتە کوڕێکی دەوڵەمەند.. گیروگرفتەکان لە ئاڵۆز بووندان تا لە کۆتاییدا سنووقی لیرەکانی لێ ئەدزن، کابراشێت و هار ئەبێت، کەئەی دەنەوە کەمێ دڵی نەرم ئەبێت و خواستی کوڕ و کچەکەی دێنێتەدی.

ئەم چیرۆکە بەشێوەیەکی کومیدی پێشکەش کراوە و نواندنەکەی چالاکی خوالێ خۆشبوو لەوکاتەدا دەنگی داوەتەوە.(1)

ئەم شانۆگەرییە کە نرخی بلیتی بینینی 250،150،50فلس بووە دیکۆرەکەی لە لایەن هونەرمەندان خالید سەعید وئازاد شەوقییەوە بە یارمەتیی قوتابیانی قوتابخانەی پیشەسازیی کراوە و دەنگ و مۆسیقاش لەلایەن(کلیمان)ەوە جێبەجێ کراوە.

کاتی خۆی مامۆستا ئەحمەد زرنگ تارێکی دەربارەی پیسکەو شانۆگەریی گلکۆ لە (ژین)دا بڵاوکردووەتەوەو تیایدا ئەڵێت:

(بەراستی تەمسیلی پیسکەی تەڕپیر تابڵێی رێک وپێکبوو، تەمسیل کەرەکان هەموویان و بە تایبەت میرزا محمود(ڕەفیق چالاک) و باجی ئایشێ(تەها خەلیل) یەک لەیەک باشترو باڵاتر دەوری خۆیان وا دەرئەخست کە لەبیرت ئەچووەوە کە گوێت لە چیرۆکێ گرتبێ یا سەیری تەمسیلێ بکەی.... هەروا هونەر و نەخشەو نیگار و پەردە و دیکۆر و دەرهێنان و ڕازاندنەوەی شانۆو ئەلکتریک و مۆسیقا سەراپا خوار هەمووی باش و ڕێک وپێک و سوود بەخش بوون).(2)

2-گڵکۆی تازەی لەیل:

ئەم شانۆگەرییە، لەگەڵ پیسکەی تەڕپیردا بۆماوەی هەفتەیەك لەلایەن هەمان دەستەی ناوبراوەوە پێشکەش کراوە. ئەم شانۆگەرییە کاتی خۆی کە پێشکەش کراوە وا ڕاگەێنراوە کە لەو شیعرەبە ناوبانگەی ئەحمەد بەگی کۆماسی‌یەوە ئامادەکراوە کە پیرەمێردی ئەمر گۆڕیویەتە سەر لەهجەی سلێمانی، ئەحمەد بەگیش کاراکتەری سەرەکی تێکستەکە بووە بەڵام پیرەمێرد خۆی لەیەکێك لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی(ژین)دا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە گڵکۆی تازەی لەیل هیی حەمە ئاغای دەربەند فەقەرەیە نەک کۆماسی.(3)

ئەم شانۆگەرییە لەلایەن هونەرمەندی خوالێ خۆشبوو ڕەفیق چالاکەوە ئامادەکراوە و هەرخۆشی دەرهێنەری بووە.

چیرۆکە شانۆگەری یەکە باسی ئەحمەدبەگی کۆماسیی شاعیر ئەکات کە شەیدای(لەیل)ئەبێت، لەیلی شۆخ و شەنگیش بە هەمان شێوە دڵ ئەدات بەو، ڕۆژێکیان ئەحمەد بە مەبەستی چوونە ڕاو وشکار گوندەکەیان جێ دێڵێ و دوور ئەکەوێتەوە، وا ڕێ ئەکەوێ لەو ماوەیەدا کەئەحمەد لەوێ نابێت(میر)ێکی دەست ڕۆیشتوو دێتە خوازبێنی لەیل و مام سلێمانی باوکی لەیلیش ڕازی ئەبێ و ئەیداتێ! بەڵام لەیل ئەم شووە ناکات و بۆ ڕزگار کردنی خۆی لەو میرەولە پێناوی پاراستنی پەیمانی دڵدارییەکەی خۆیدا پەنا ئەباتە بەر مەرگ و خۆی ئەکوژێت.

کە ئەحمەد بەگ لەڕاو ئەگەڕێتەوە و بەم ڕووداوە دڵ تەزێنە ئەزانێت، ئارامی نامێنێ و بەدەم کوڵی گریانەوە ئەچێتە سەر گۆڕەکەی لەیل و شیوەن و لاواندنەوەی بۆ ئەکات... ئەحمەد لەسەر گڵکۆی لەیل ئەو شیعرە بەناو بانگە ئەڵێت کە سەرەتاکەی بەمەدەستی پێ ئەکات:

گڵکۆی تازە لەیل، گڵکۆی تازەی لەیل

ئەمڕۆ چوومە سەیر گڵکۆی تازەی لەیل

جوابێکم ئەبیست بۆ دڵەی مەحزوون

ئەنجا بڵێسەم گەیشتە گەردوون

لە کۆتایشدا، لە زمان لەیلەوە شیعرەکە ئەڵێت:

ئەمەندە خاکم لە جەستەبارە

ئەجێکەی جواب ئەڕێی گوفتارە

هەرچەند بگەڕێیت بێ باك یا خەمناك

زۆرت نەماوە، تۆش دێیتە ژێر خاك

ئەم شانۆگەرییە، کە(بوکێکی ناکام)یشی پێ وتراوە، لە چەند پەردەیەکدا بووە و ئەکتەرەکانی بریتی بوون لەم هونەرمەندانە:-

ڕەفیق چالاك- دەوری کوڕ، واتە ئەحمەد بەگی کۆماسی.

ئەنوەر ئەحمەد- لەیل.

نوری وەشتی- مام سلێمان.

لەتیف حەمدی- میر

تەها خەلیل- پیاوماقووڵی میر.

قادری نوری بەگ- پیاوماقووڵ.

فوئاد عومەر- پیاوماقووڵ.(4)

لە شانۆگەرییەکەدا ڕەفیق چالاك بەدەنگی بە جۆشی خۆی چەند شیعرێکی مەولەوی وتووە، هەروەها لەدوو دیمەندا بە جۆرێك لاواندویەتەوە و شیعرەکەی گڵکۆی تازەی لەیلی هێندە بە سۆزەوە وتووە بینەران بە دڵ لەگەڵ هەڵوێستەکەیدا بوون و فرمێسك لە چاویان بارییوە.

لەم شانۆگەرییەدا دیکۆرێکی موجەسسەمی قەشەنگ لەلایەن هونەرمەندان ئازاد شەوقی و خالید سەعیدەوە کراوە و هەر ئەمانیش ئارایشتی ئەکتەرەکانیان کردووە و کاك بەهزاد ڕاپەڕێنەری تیشك بووە.

لە نووسینەکەی مامۆستا ئەحمەد زرنگدا باسی شانۆگەریی(گڵکۆی تازە لەیل) بەم جۆرە کراوە:

(نیشاندانی ڕەوشت و خووی بەرزی ڕابوردومان، دڵداری پاکی کوردەواری، گێڕانەوەی سەر گوزەشتەی کۆنی پڕ بەهامان، دەرخستی ئەدەبی بەرز وشیعری بالآمان...

ئەوەی ئەمجارە چووبی و ئەم تەمسیلەی دیبێ بڕوائەکات کە بەڕاستی شانۆ قوتابخانەی گەلە... بەمەداو بە هەموو تەمسیلەکانی سالآنی ڕابواردووشمانەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە ئێمە ئامادەین، خاوەن توانایین، ئەم جۆرە هونەر و ئیشەپڕ سوودانەمان لە باردایە، هونەرمەندی بەرز و بە دەسەلآتمان تیایە، هەرواش دانیشتووانی شار بەوەدا کە بە ڕۆژی بەفر وشەوی سەرما ئەچوون وستایشیان ئەکرد، ئەمە وا ئەگەێنێ ئەم هەستە بەرزە لە هەمووانداییە.... بەڵام ئاخ!! خۆزگە بەم زووانە شانۆیەکی دامەزراوی ڕێك و پێکمان ئەبوو، هەروەها فرقەیەکی تەمسیلی هەمیشە ئامادەو بێ کەم و کوڕیشمان بۆ ڕێك ئەخرا)(5)

## پەراوێزەکان

1دەربارەی ئەم شانۆگەرییەو ڕەفیق چالاك بڕوانە: ڕۆژنامەی العراق، العدد1323، 1980/6/30، البخیل، بقلم یاسین قادر البرزنجی.

2ڕۆژنامەی ژین، ژمارە14، 1333/2/1957.

3گۆڤاری بەیان، ژمارە101-102، 1984، گلکۆی تازەی لەیل و لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی، نووسینی مامۆستا مەحمود زامدار.

4ئەو ناوانەی لە لاپەڕە65ی کتێبی(شانۆوشانۆی کوردەواری)ی کاك حەسەن تەنیا دا نووسراون هەڵەن و ئەکتەرەکانی ئەم شانۆگەرییە تەنیا ئەمانە بوون کە ناومان بردوون.



# یادی هو نەرمەند ڕەفیق چالاك

عەبدولکەریم عەبدولڕەحمان



خوالی خوشبوو رەفیق چالاك یەکێك بوە لەو هونەرمەندە هەڵکەوتو بە توانایانەی کە توانایەکی یەکجارزوری هەبو لە هونەر، لە نوسین، لە تەمسیل کردن گەلی بەهرەی تریشدا. رەفیق توفیق کە بەرەفیق چالاك ناسراوە لە سالی1923دا لە شاری سلیمانی هاتوتە دنیاوە خویندنی لە سلیمانی تەواو کردوە بوە بە ماموستا بە زوریش ماموستای سروود بوە لە قوتابخانە سەرەتایەکانی سلیمانیدا، لە سالەکانی 950وە چۆتە ئیسگەی کوردی بەغدا و مزیع بوە. گەلێك خزمەتی ئیسگەی کوردی بەغدای کردوەو توانیویەتی ئەم ئیستگەیە زورپیش بخات، تیپی تەمسیلی لە ئیسگەی کوردی بەغدا دامەزراندوە لەگەڵ ئەحمد دەنگ گەورە و نوری عمر و ئەحمد واولاودە و فایەق دڵزار کە ئەندامی هەمیشەی تیپەکەبون جار جار علی مردان هاوبەشی لەگەڵ کردون وەك تەمسیلی نامەی بەنگ کێشان کە لە 950/8/2 بلاوکراوەتەوە چەند کەسیکی تریش هاوبەشیان لەگەڵ کردوون وەك قادر دیلان و تایەر توفیق و علی ئیبراهیم هیندی. ئەم چیروکانە لە نوسینی رفیق چالاك خۆی بون. هێندێکی خۆی کردویەتی بە کوردی لەگەڵ دەست کاریدا، ئەم تیپە تاساڵەکانی 955 بەردەوام بون هەموو هەفتەیەك لە پیش کەش کردنی چیروکی تەمسیلی هەفتانە بەشیوەی راستوخو دوای پەیدابونی ئامیری تومار کردن چەند چیروکێك تومارکراون و ماون و پاریزراون هەروەها بە هوی هەوڵو تەقەلای رەفیق چالاکەوە توانی بەشێك لە گۆڤاری(هنا بغداد) تەرخان بکریت بو ئیسگەی کوردی. لەم گۆڤارەدا بەرنامەکانی رادیوی کوردی تیدا بلاوئەکرایەوە هەروەها چەندەها وتاری بە کەڵك و هەڵبەست و وێنەی هونەرمەندان و بەریوەبەرانی رادیوی کوردی بەغدا یەکەم ژمارەی ئەم گوڤارە لە تموزی سالی951دابو، هەروەك هونەرمەندو دەنگ خوش بو چەند کتێب و نامیلکەیەکیشی بە چاپ گەیاندوە وەك: کارکردنی بەکەڵك سالی952 لە بەغدا ئەم نامیلکەیە لە ئیسگەی کوردی بەغدا بە شیوەی چیروکی تەمسیلی بلاوکراوەتەوە هیزی تاریکی یان(تاوانی دڵداری) لە نوسینی تولستوی گۆڕینی بو کوردی لە سالی 955دا بە نازناوی رابەر بڵاوکراوەتەوە لە چاپخانەی معارف لە چاپ دراوە دارستانەکانمان سالی 957 لە چاپخانەی معاریف لە بەغدا لە چاپ دراوە جغرافیەی عیراق کتێبێکی قوتابخانەیە لەگەڵ چەند ماموستایەکدا کردوویانە بە کوردی سالی 973لە بەغدا لە چاپ دراوە رەفیق چالاکی بلیمەت گەلیك لە هەڵبەستە بە نرخو بەرزەکانی شاعیرە بە ناوبانگەکانی بە گورانیەوە وتوە وەك هەڵبەستەکانی (پیرمێرد، مەحوی، گوران، کوردی) هەروەها خاوەنی گەلێك بەهرەی ئەدەبی و هونەریش بوە وەك خەتیبێکی زۆر بە توانا بوە لە گەلێك ئاهەنگدا هاوبەشی کردوە لەسەر شانوش گەلێك هاوبەشی کردووە.

هەروەها کۆمەڵێك چیروك و سەرگوزشتە پەخشانی ئەدەبی بەشێوەیەکی هونەری نایاب لە ساڵەکانی پەنجاکاندا لە گۆڤاری(ئاگاو رووداوی هەفتە) و گۆڤاری (پەیام)دا بڵاوکردۆتەوە بەناوی نهێنیوە، ماوەیەك سکرتێری نووسینی گۆڤاری برایەتی بووە لە بەغدا هەروەها سەرۆکی کۆمەڵەی هونەری وێژەی کوردی بووە بۆماوەی سی دەورە بو ماوەی دوو ساڵ پێش مردنی پسپۆری خویندنەوەی دەقی وتارەکان بووە لە ئیستگەی کوردی بەغدا پێش ساڵەکانی950یش لەگەڵ شاعیر (گۆران و رەمزی قەزاز) ئیسگەیەکی رادیوی کوردیان لە شاری یافا لە فەلەستین بەریوە بردوە.

بەم جۆرە ژیانی بردوەتەسەر تا لە رۆژی 7کانونی یەکەمی ساڵی 973بەنەخۆش دڵ کوچی دوای کردوە لە شاری سلیمانی لە تەمەنی50ساڵیدا و بە گردی سەیوان سپێراوە هەزار سڵاو لەگیانی پاکی هونەرمەند رەفیق چالاك.

# چالاك..
# چراوگی بەهرە و هونەر

رەووف بێگەرد

نیوەی دووەمی سالآنی پەنجای سەدەی رابوردوو، دەرگای تیرۆژێکی رووناکبیری و هوشیاریی سیاسی و ئەدەبیی لەسەر نەوەی ئێمە کردەوە، ئێمەیەکی مێردمندالی تازە بەگروگالّ کەوتووی دنیای شیعر و ئەدەب و سیاسەت، گۆڤاری هیواو شەفەق و هەتاو رۆژنامەی ژین لە بلاوکردنەوەی بەرهەمی تاك و تەرای نووسەری بەتواناندا چاویان بۆ دوورتر روانین گە شاندینەوە، لە نێو دەست و دلی گەورە و سۆزی پڕ لە پەرۆشی ئەواندا ئێمەیش یەکەم بەرهەمی سادە وساکاری خۆمان نووسی، ئەو بەرهەمەو بۆ ئەوتەمەنە لە یەکەمین کورپەی دوای پانزەبیست سالی هاوسەری و، بەکارهێنانی دەیان داو و دەرمانی پزیشك و نوشتەی مەلا و دوعای شێخ بەتامتربوو، ئەوە یەکەم مانیفێستی شناسی خۆت و بەرنامەی ئایندە و ورشەی داهێنانت بوو، بەداخەوە ئەو یەکەم بەیانەی ئێمە، ئێمەی سادەی تەژی بەسۆزێکی بیرخەلەتێنی دوور لە کلتووری دەولەمەند و زەمینەی فیکری تابلێی بەرهەمێکی کەم بڕشت و لارەملی نێوشاکارەکان بوو، کە ئێستا لێی دەڕوانیت ساکاریەکەی تارادەیەکە ناشێت لە مێژووی ئەدەبیی خۆتدا شەرم نەت گرێت، بەلآم بۆ ئەوسا بردنەوەی گرەوێك بوو، کە لەئێستادا ژیان نامەی نووسەرانێکی وەك رامبۆو دیستۆفسکی و بورخیس و لیرمەنتۆف و پوشکین و دەیانی تر دەخوێنیتەوە و بەراوردی ئەو دوو تەمەنە دەکەیت، دەزانیت دیوارەکان چەندە ئەستورو بەربەستەکان چەند بە ئەوق و زەمینەکان چەندە تەژین بە نا یەکسانی. تۆ لە بیابانێکی قاقڕی فەرهەنگ و شارستانی و ئابووریەکی سەختی سەرچاوەکا نی رووناکبیری و زانستیدا ئوقمی وەهمێکی بیّ بنەمای مێژوو هاتبوویت، کتێبخانەیەکی هەتیوی ماندوو بە چەند دیوانە شیعرێکی کلاسیکی، تازە بە تازە بەیازە دەستاو دەست پیّ کراوە پەڕپووتەکانی ناو حوجرە و مزگەوت رابەریی مەعریفەو شارستانیەتی نوێی دەکردیت! لەبیرو ئەندێشەی پێشکەوتووی گەلان و بزاوتی ئەدەبی و ڕۆشنگەری ئەوروپا کە دوو سەدە زیاتربوو دەیان زانکۆو سەدان بنکەی رووناکبیری و چاپەمەنی تیا دامەزرابوو تۆ هێشتا گوێیەکی کەڕ گەرورەکی بیّ سەدا بوویت. بۆ یە درەوشانەوەی بەهرەیەکی دەگمەن و هەلکەوتنی داهێنەرێك سەرسامکەربوو، لەو دۆخەمێژووکردەدا، ئێمە نەوەیەکی بەدبەخت و سەرلیّ شێواو و مەزلووم بووین، لەبەردەم کلتورێکی دڵرەق و نا هاوسەنگدا تۆش لەرزۆك و بیّ ئیرادەیت، بەلآم بۆ هەندێکمان ژیلەمۆی عەشقێك دنەیەکی ملەقوتێ و پزیسکێکی سووسەکردن ماکی وەستان و رامانبوو، لەو عاشقە رووتانە دەچووین دوور بەدوور حەزمان لە نۆشینی ژەهری دلداری بێت و دەستمان نەکەوێت، وەك بزانین لەو دیو ئێمەوە شۆخێك هەیە تاك و باخێك هەیە پاك و دنیایەك هەیە لاجیوەردی. ئێمەی کزۆلەکەوتووی بیابانە قاقڕەکە ئەزمانی ئەو دنیایەمان دەزانی و بە ئەبەشاکاریان ئاشنابووین، تەنانەت دەست کورتی زمانی نەتەوەکانی دەوروبەریشمان بووین، بۆیە سەری عەشقەکەمان بەکۆشی ئەوتاك و ئەرایانەداکردبوو کە سروەیەکی مانش و سین و چیا سەختەکانی پیرنە و نیل و ڤۆلگایان بۆ دەهێنایین. چاکترین رێگای ئەو پەیوەندیەش وەرگێڕان بوو لە زمانی بێگانەوە بۆ کوردی، کە بۆ ئەو کاتە زوربەی لە زمانی عەربیەوە بوو، بەتایبەتی لەوولآتی فیرعەونەکانەوە کە بۆ ئێمە کانگای داهێنانی هونەری و ئەدەبی بوو، چ وەك فیلمەکانی سینەما یان بەرهەمی کتێب و چاپەمەنی.

یەکێك لەو بەهرەمەندە ئاوازانەی ئەم پەیامەی بە ئێمەگەیاند مامۆستاو هونەرمەند(رەفیق چالاك)بوو، سەرەتا لە رادیۆی کوردی بەغداوە کە هەموو هەفتەیەك چیرۆکێکی تەمسیلی بلآودەکردەوە، پاشان بەو شانۆگەریانەی وەری دەگێڕان و خۆی دەوری سەرەکیی تیادەبینین یاندەری دەهێنان، ئەو کارانە یەکێك بوو لەو سەرچاوانەی گوێیان بە چیرۆك و بەیتی خۆمالی و بەرهەمی بێگانە راهێنام، هەستم کرد دەنگێك هەیە رچەشیکێنە و سیمای سەردەمی نوێی پێوەیە، بە سیناریوکردنی حیکایەتی خۆمالی و نواندنی، فۆرمێکی تازەی دوورلە گیرانەوەی ئاسایی بوو کە تا ئەوسەردەمە دەقمان پێوە گرتبوو. ئەو کارانە دوورنەبوون لە دەقێکی ئامادەکراوی نویّ کەرەگەزی تری وەك گۆرانی و شیعریان لە خۆدەگرت و چێژی تایبەتیان بەگویّ گر و بینەر دەبەخشی.

لە بواری شانۆدا کە سالی1957 بۆ یەکەم جار شانۆگەریی پیسکەی تەرپیری مولیری فەرەنسیم بینی کە چالاك دەری هێنابوو، نەك تەنیا شانۆم وەك بینەرێکی ئاسایی و کەم تەمەن خۆش ویست بەلکوو شەوانێك بە خەیالیەوە دەنووستم، دیمەنەکانم دەهێنایەوە بەرچاوم و بیرۆکە کۆمەلآیەتیەکەی زۆری کاریّ کردبووم. ئەکتەرە هەرە دەرکەوتوەکەیشی، مامۆستا چالاك توانی بۆ یەکەمجار پێم بلیّ نواندن ماناى چی و چۆن ئەکتەر دەتوانێت واز لە حەقیقەتی خۆی بێنێت و ببێتە مرۆڤێکی تری دژبەو هەقیقەتە، تا ئێستایش ئەو چێژ و سەرسامیە لە یادناکەم کە دەشێت تۆزێکی عاشقانەی هونەریی تیاوەشاندبم، وەك چۆن هەمیشە لەبەرئەم بلێسەی یەکەم خۆشەویستیمدا سەرمای تەمەنم گەرم دەکەمەوە. پیسکەی تەرپیر داهێنانێکی دەگمەنی ئەو سەردەمەی شانۆی کوردی بوو کە پێشترنەکرابوو. هەر لەو ماوە یەدا شانۆگەریی گلکۆی تازەی لەیلی ئەحمەدبەگی کۆماسی یان حەمەئاغای دەربەندفەقەرەنمایش کرا کە خودی چالاك ئامادەکار و دەرهێنەری بوو. مامۆستا رەفیق چالاك بەو کارانەی ئەوەی لای ئێمە سەلماند کە چراوگێکی نوێی وزە و توانای گەورەی ئەوبوارە و بەخشندەیەکی کەم وێنەیە. ئەوسا من تەنیا لە رێگەی شانۆگەری و تەمسیل و هەندێك نووسینیەوە دەمناسی نەك پەیوەندی تایبەتی، بەلآم یەکەم ناسینی نزیکم سالی1963بوو، دوای گەردشە خوێناویەکەی بەعس بەپێنج مانگ، لە نۆی حوزەیراندا زەعیم صدیق رەش بگیریەکی ناجوامێریانەی دژی خەلکی سلێمانی ئەنجامدا، هەزاران کەسی خزاندە زیندان و هۆلّ و تەویلەکانی حامیەی ئەوساوە کە قێزەونترین کاری شۆڤینیانەی دژی بە هەموتۆزێ و چین و کۆمەلآنی خەلکی شارەکە ئەنجامدا، رژێمی بەعس دام و دەزگای ئەمنی و هێزەکانی سوپای ئەوسای عیراقی رژاندە کوردستانەوەو بە تایبەتی کەوتە تۆلەسەندن لە سلێمانی و دەوروبەری. لە ئاوگیراوەکاندا دەیان رووناکبیرو دادوەرو پزیشك و مامۆستاو قوتابی و خەلکی ئاسایی تر هەبوون. زۆریان سەر بە پارتە سیاسیەکانی ئەوسەردەمەو رێکخراوە پیشەییەکانی کوردستان بوون

و، تێکڕای ئەوانیش هەواداری شۆڕشی کوردستان و دژی دەسەڵاتی بەغدابوون، ئەگەرچی گێرانی ئەو هەمووخەڵکە و هێشتنەوە وشەهیدکردنی هەندێکیان تراژیدیای حوزەیرانی لێ کەوتەوە، بەڵام بەلای گیراو و دانیشتوانی شارەوە کەرنەڤاڵی خۆبەدەستەوەنەدان و بەرگری وگاڵتەپێ هاتنبوو بەڕژێم و سوپاکەی، چونکە نە لە ورەی خەڵکی هێنایەخوارێ و نەتوانی دەستکەوتی سەربازی و ئەمنی بەدەست بێنێت.

مامۆستا چالاك یەکێك بوو لە گیراوەکان کە وەك پیاوێکی بەئەزموون قسەی دەکرد، ئێمەی لاوانی کۆدەکردەوە و شیعری بۆ دەخوێندینەوە، بەدەنگە خۆشەکەی شیعری مەحوی و مەولەوی و نالی بە گۆرانیی دەوت، دۆخی زیندانی بۆ کردبووینە گەشتی هونەر و لەنزیکەوە بەهرەدرەکانمانی ناسی و زیاتر لەسەر ئەدەب و هونەر قسەی دەکرد، لە جارێکی بردنیدا بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵ کردن زۆر درەنگ گەڕایەوە کە بوو بە هۆی نیگەرانیمان، کە هاتەوە هێندە بەفانتازیەوە وردەکاری رووداوەکەی گێڕایەوە کە چۆن چاڵیان بۆ هەڵکەندوە و هەڕەشەی ناشتنیان لێ کردوە دەت وت لە شانۆگەریەکی تراژ کۆمیدیدا دەوری یەکەم ئەکتەر دەبینێت، چونکە دور لەخۆ هەڵکێشان و پاڕانەوە دیمەنی دیالۆگێکی مەسخەرە ئامێزی وای بۆرەخساندبوون کە نەخۆی دابوەدەستەوە و نە ئەوانی لە گوماندا هێشتبوەوە.

لەدوای سالّی حەفتاوە کە بووبە لێپرسراوی گۆڤاری برایی چەند جارێك لە بەغدا چوومەوەلای، جارێکیان وتارێکم بۆ برد کە لە فارسییەوە وەرمگێڕابوو لەسەر(سمکۆی شوکاك) نووسەرەکەی یەکێك بوو لەو ئەفسەرە عەجەمانەی خۆی بەشداری لە کوشتنی سمکۆداکردبوو. لە شوێنێکی وتارەکەدا دەڵێت: "دوای ئەوەی هەواڵی هاتنی سمکۆمان بیست بۆ شاری شنۆ کە لەلایەن حکومەتەوە بەڵێنی قسەکردنی پیدرابوو، ئێمە لە بندار و هەندێ شوێنی تری سەر ڕێگای هاتنەکەی بۆ سەمان بۆ نایەوە و خۆمان بۆ کوشتنی ئامادەکرد، ئەو بێ دەربەستانە هات، چونکە بەڵێنی ئەوەی وەرگرتبوو کە هیچی لێ ناکرێت، کە کەوتە بەرچاسووسی تفەنگ و لەپێشەوە تەقەمان لێ کرد لەسەر ئەسپەکەی سووڕا، دەستی بەسنگیەوەگرت و(جوێنێکی بەعەجەمدا) و کەوت. کە وتارەکە لە براییدا بلاوبووەوە ڕستەی جوێنی بەعەجەمدا گۆرابوو بە (جوینێکی بەعەجەمیدا) دیارە ئەمە مانای رستەکەی گۆریبوو کە منی زۆر نیگەران کرد، لەبەرئەوە چوومەلای مامۆستا چالاك و گلەی ئەوەم لێ کرد کە هەڵەی چاپ مانای وتەکەی سمکۆی گۆڕیوە، بە شێوازەخۆشەکەی و پێکەنینە دانسقەکەی پێی وتم: کوڕی باوکم ئەوە هەڵەی چاپ نیە، ئەوە خۆم گۆڕیومەخۆم، ئەمەیان سیاسەتەو جارێ ئێوە باڕن نایزانن، ئێمە(مەبەستی شۆڕشی ئەوسای کوردبوو) هێشتا لەگەڵ مامە ئێراندا نان و ئاوێکمان لە بەیناماوە و نامانەوێت لەبەرخاتری بەعس دەستبەرداری بین. چۆن دەهێڵم هەروا بە ئاسانی جوێن بەعەجەم بدرێت و دڵی ئێرانمان لێ برەنجێت . لە سەفەرێکی ترمدا باسی شانۆگەریەکی تازەی خۆی کرد بە ناوی (دکتۆری دێم)، هەموودیمەن و بیرۆکە و ئەکتەرەکانی بۆ باس کردم و داوای مانەوەیی لێ کردم بۆبینینی، بەداخەوە مارەی نواندنەکە چەند رۆژێکی مابوو منیش دەبووبگەڕێمەوە سلێمانی و بە بینینی بەرهەمەکەی شادنەبووم. سلاو لە یادو دیدارەکانی ئەو چراوگی بەهرەیە.





# کۆچی چالاک

هەواڵی ناخۆش کۆچی چالاک بوو

هونەرمەندێ بوو لە ناومان تاک بوو

وێژە و هۆنراوەو چیرۆکی جوانی

پڕە لە پەند و ڕازی نیهانی

چالاکی کۆڕی وێژەو هونەر بووی

بێباکی ڕێگەی سەخت و خەتەر بووی

چیرۆکنووسەکەی ناو جەرگەی کوردم

مێژوونووسەکەی بیرتیژوو ووردم

ئەی پاڵەوانی ڕێبازی خەبات

ئەی هونەرمەندی ئاواز و ئاوات

کشا ئەستێرەی ئاسمانی تارت

لە یادمان ناچێ شعیر و وتارت

سۆز و ئاوازت لەم نیشتمانە

هەرگیز کۆن نابێ و لەسەر زمانە

لە قسەی نەستەق یا وشەی کوردی

بلیمەتێ بووی داخەکەم مردی

پلاری قەدەر هەر بۆتۆش نییە

چەن زانای پێکا و هیچ چاریش نییە

مەلا تۆفیقی حاجی ابراهیم

دانەر/ بێ چاو

لەلاپەڕە (43) ی گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە (8) ساڵی 4 اغستۆسی 1943 دا ئەم دەقە بڵاو کراوەتەوە

## ایستگەی بی تەلی کوردوستان

## لە ڕۆژهەڵاتی نزیکەوە

کورد بەبێ ئەوەی لامژی بکا بەو مرازەی گەیشت کە دەنگی کورد و زمانی کورد و ناوی کورد لە هەموو گێتیدا بڵاوبێتەوە، ئەمەش کێ کردی؟ دیارە غیری دولەتە گەورەکەی بریتانیا نەبێ بەهۆی خزمایەتیەوە چاوی لە کورد بێ کەسێکی تر ئەوەی بۆ نەکردوە و نایکا، هات لە یافا ایستگەیەکی بێ تەلی عالمەی بۆ دانا، سەربەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی هەموو چەشنە دەنگوباسێکو هەموو جۆرە مەقام و بەستەیەك، بەرانبەر بەم چاودێریو بەشە باشە گەلاوێژ بەناوی هەموو کوردەوە سوپاسی ئەکا و داوای پایەداری ئەو دەوڵەتە گەورەیە ئەکا.

ایجگار دو کورە گەنجەکەی کوردستان "گۆران و رفیق چالاك" بەجارێ ئەوەندەی تر هێناویانەتە فەر، بەڕاستی خزمەتێکی زمانی کوردی باش ئەکەن، خوا بیانپارێزێ و هەر بژین.

لەم وەختانەدا گوێ تان لە هالو هەواڵ ئەبێ

بەیانیان لە سەعات 101/2 وە تا 11

ایواران لە سەعات 3 وە تا 4

هی بیروتیش لە سەعات 6 ی ئێوارەدا گوێ تان لێ ئەبێ.

## خوشکو برایانی خۆشەویست

## سڵاوێکی گەرمتان لی بێت

لەبیرەوەری هونەرمەندی ناسراوی کورد، مامۆستا رەفیق چالاك، پێویستە بە تەقدیرو پێزانینەوە یادی کارە هونەرییی و چالاکیە ئەدەبیەکانی بکەینەوە و شوێنی خۆی، شوێنی دیار و بەرزی خۆی لە ئەدەبی کوردیدا، لە هونەری کوردیدا بۆ دیاری بکەین. بە تایبەتی لە جۆشدانی گیانی شۆڕشگێری کوردایەتی دا لە ناو کومەڵانی خەڵکی کوردستان دا بە ڕێگەی سروود و ئاواز و هونەری رەسەنی کوردیەوە. مامۆستا رەفیق چالاك لە کۆڕی کوردایەتی دا نەك هەر لە ڕێگەی ئەدەبو هونەری کوردیدا دەورێکی گرنگو دیاری خۆی هەبووە، بەڵکو لە ڕێگەی پەروەردەی کوڕەکانیشیەوە هەر خزمەتگوزاریی کوردایەتی بووەو روڵەیەکی دلێری شەهیدبووە و یەکێکی تریشیان لە خەباتی شۆڕشگیرانەو ئەدەبی و فیکری و سیاسیدا شوێنەواری خۆی دیارکردوە و جێ پەنجەی ڕەنگینی خۆی جێ هیشتووە. بۆیە بێگومان هەقی خۆیەتی کە هەمولایەکمان، بە ڕێزوتەقدیرەوە یادی ئەو کەڵە هونەرمەندە گەورەیەی کورد بکەینەوە و شوێنی خۆی لە مێژووی کوردەواریدا بۆ برازێنینەوە

برای دڵسوزتان

مام جەلال

1992/12/9

953/1/23

### بۆ لاوێکی گرا نمایەو زانایێکی بە نرخ برای شیرینی سورداش و بیری ناودڵی دۆزەخەی ئاشم شیری بی باك یانی کاکە چالاك.

لە پاش سپاسێکی گەرم و گووڕ و گوشینی دەستە بە جەوهەرەکانت، کاکە گیان خۆت ئەزانیت کە لە کوردستانی ایمە دا هیچ کاتێك شاعیر نەژیاوە، منیش بە ناچاری کۆچم کرد بۆ کرکوك، ایتر نازانم لەکرکوکەوە بوکوێ ئەچم نیازم وەهایە ئەم زستانە لە کرکوك بم، ئەگەر هەتا بەهار کرێکاریم دەست کەوت ئەوا دائەنیشم ئەگەر دەستم نەکەوت ناچارم سونەتی شاعیرە کۆنەکانمان بەجێ بهێنم، یانی بە تەواوی تەرکی نیشتمان بکەم وەکو حاجی قادر لە استنبوڵ و کوردی لە تاران و نالی لە بێروت و بێتوشی لە بصرە مردن، اخۆ قانع لە کوێ قضا و بەڵای کورد و کوردستان ئەبات. ئیشکردنی کرکوکیش هەرشەریکەیە، منیش کە سێ کوڕی هەرزەکاری پێ گەیشتیوم هەیە ئەگەر یەکێکیان لە شریکە بۆم بکرایە بە کرێکار نانی هەمومانی پەیدا ئەکرد، بەڵام دامەزراندنی شریکە پشتی زۆر ئەستور و باخەل پڕ لە پارەی ئەوێت خۆخۆت ئەزانیت کە هەمو پشتی من هەرتۆیت کە لەمو باریك تری و با خەڵیشم لە کەللەی هەندێ خاوەن کورسی خاڵی ترو بۆشترە. کاکە گیان کوڕێکم کردوە بە بۆی لە فندق الرافدین ئەگەر نوسراوت بۆ ناردم بەم ئەدرەسە لە خوارەوە نوسراوە پێم ئەگات .

ایتر هەربژیت ازیزەکەم.

مخلصتان قانع

کرکوك

فندق الرفدین برهان قانع

953/1/29

**لە ساویلکە و هیچ نەزانترینی هۆزی کوردەوە بۆ هاروهاج و زیتەڵە ترین هۆزیی کورد!**

**یانی لە قانعەوە بو چالاك.**

کاکە گیان تۆخوت ئەزانیت کەتەواوی تەمەنم لەشعردا تەواوکرد، یاخوا بەمیراتم کەوێت دەسکێ کەوەر ناکات کە نانێکی پێوەبخۆم. بەڵام ئەزانم ئەم هۆزە نرخ نەزانەمان لە پاش مردنم کونەبنەوە سەرگۆڕەکەم و حفلەم بۆ ئەکەن یان ئەڵێن بەیەکتر: بەخوا خەسارێکی قورس وگران کەوت لە کورد و کوردستان بریا هەزار کوردی بێ خێر بمردایە قانع بمایە، چونکە خزمەتی زمانەکەمانی ئەکرد. کاکە گیان با بێمەوەسەر مطـلب:

دیوانە شعرەکەم کرد بە پێنج بەندەوە بەندی یەکەم کە ناوی گوڵاڵەی مەریوان بو، لەسەر ئەرکی معارف پەروەر سید علاء الدین سجادی چاپ و بلاوکرایەوە، باوەڕ بفەرمو سنەیی و سەقزی دێینە پێنجوێن لە منداڵە پێنجوێنی ئەکڕن بە دەرپییە چونکو لە دوکانەکاندا نەماوە. بەندی دوهەمین لەلای سید علاء الدین بو کە چاپ و بلاوی بکاتەوە، بێ دەستی و پەرێشانیم گەیشتە دەرەجەیەك وەرم گرتەوە لە سیدی ناوبراو کە بەڵکو واستەیەك پەیدابیێت چاپ و بلاوی بکەمەوە، کاکە گیان ئەگەر تۆ کەفیلێکم بو پەیدا بکەیت کە متبعە بۆم چاپ بکات و چل شەو لێم بخایەنێت، من ئەتوانم بەم چل شەوە پارەی متبعەکەیش بێنمەوە و خۆیشم قانجازی وای لێ ئەکەم کەدەستم بکەوێتە ئیش بۆ چاپ کردنی ئەو سێ بەندەکەی تر. برا شیرنەکەم ئەگەر ئەم هەوەڵجارە تۆ ببی بەسبەب، ئیترمن نەجاتم ئەبێت وەئەتوانم هەر بە دە ڕۆژ؟ بە قەدەر گوڵاڵەی مەریوان شعری تازەتر و چاك تر بڵێم. ئیتر انتظاری هیمەت و جوابت ئەکەم.

**( مخلصتان قانع )**

**ادرس کرکوك فندق الرافدین برهان قانع**

953/2/12 **( سەبارەت هاواری قانع بۆ چالاك )**

لە کوردستانەدا ئەم دی خرۆشی دڵ برینداری کەبۆ ئەو دەردە پەیدابێ تیبێ یاخو خەمخوارێ

ئەبینم هەرکەسێ بۆخۆی ئەکێشی و هەوڵی بۆخۆیە بەسەر خاکی وەها ڕەبی بەدایم بەردی لێ بارێ

بەماکینەی خەیاڵاتم غەزەل ئەدروم لە بۆ کوردان چل و شەش ساڵە ئەم ئیشە ئەکەم ئەمدی کرێداری

دەچی بکەم هوزەکەم قەدری ئەدەب نازانێ هەی هاوار؟ بەئەندازەی گەڵاتورێ وەیا تولاشی بن دارێ

ئەوانە چونە سەرکورسی وەکیلی کوردی بەدبەختن وەها گوێ یان خنی هەرگیز نەبیسن دەنگی هاوارێ

بلێن بەو حضرەتی‌نایب کەچی کرد بۆ گەل و هۆزی لەبرسا شین و گریانە لە دێهات و لە هەر شارێ

ئەوا ایمە هەمو مردین لە پاشا نایبی کێ بیت؟ لە پێی کێ وەرگری کورسی و معاش و بەستە دنیارێ؟

شکاتی قانعی ئەمرۆ لەلای چالاکی مزلومە

لەتۆ بێ دەس ترە قانع تەماتە چون بکا کارێ؟

لەمن بێ دەس تر و لەمن نرخ نەزانراوتر کاکە چالاکە.

کاکە گیان شعری من و زانینی تۆ بە میراتمان کەوێت، یارە دڵسۆزەکەم ئەو ڕوژە فەرموت دو کاغزت بـۆ وەرنـەگرم کـە کوڕێکیانت لە شریکە دابمەزرێن وەیەکیکیشـیان سعادەتی متصرف دای بمـەزرێنێت. لاوە بـە نرخـە نـرخ نەزانراوەکـەم بـە خوشەویستی هەردوکمان قەسەم کە لە تۆجیابومەوە تەماشای باخەڵی خومم کرد چواردە فلسم پێ بو، جاجمێکم هێنا بو کە لە ناو قتارا سەرمام نەبێ بە ناچاری فروشتم بۆ پارەی بلیتی قتار. خوا بم گرێت بۆ عزەتی نەفسم هـەرچیم کرد روم نـەبو بیم هاوارت بۆ بهێنم، بەناچاری گەڕرامەوە بۆ کرکوك. ئەگەر خوانخواستە توش بیبت بە اشرافی کوردان، یانی منت لـەبیر بچێتـەوە ئەوا لەم ژورە سارد و سررەدا لە کرکوك هەمومان ئەمرین، باوە جود هیوام وایە کە لـەبیرت نەچمەوە چونکو هێشتا نەبوی بە خاوەن قەسرو کورسی. ئەگەر ئەو کاغزانەم فریابخەیت ئەمە یەکەم ئیشە لە کوردستاندا، چونکو تاایستە لـە کوردستاندا هیچ کەس خەمی هیچ لێ قەوماوێکی نەخواردوە. ایتر انتزاری غیرەتی شێرانەت ئەکەم لاوە بە نرخەکەم.

بەم ئەدرسەی خوارەوە هەرچیم بۆ بنوسی پێم ئەگات

**بچوکتان قانع**

**کرکوك.. دائرەی خزێنە بە واسـطـەی احمد فرجەوە بۆ قـانـع**

# خولیاو بیروبۆچوون و ئارەزو و شێوەی ژیانی هونەرمەند(ڕەفیق چالاك)

ئامادەکردنی: بورهان قەرەداغی



ڕەفیق چالاك و چالاکی کوڕی

**وتەیەکی کورت:**

*خوێنەری خۆشەویست من وەك وەفای شانۆکارێك دەمەوێت ڕێز لە چالاکیە شانۆییەکانی ئەو هونەرمەندە مەزنە بنێم و هەر بەو بۆنەیەشەوە هەوڵمداوە لەسەرزمانی بەڕێزان کاك(چالاك و کاك ئازاد)ی کوڕی و کاك(ئاوات)ی برازایەوە ڕووناکی بخەمە سەر خولیاو بیرو بۆچوون و شێوەی ژیان و ئارەزووەکانی ئەم هونەرمەندە.*

**کاك( چالاك )ی کوڕە گەورەی باس لە ئارەزووەکانی مامۆستا ڕەفیق چالاك دەکات و دەڵێت:**

تا دواڕۆژی ژیانی، خۆشەویستی هونەر و ئەدەب لە خوێن و گیانیدا زۆربەجۆش بووە، دوای ئەوەی کە تووشی نەخۆشی دڵیش بوو تەنانەت لەسەر جێگای نەخۆشیدا وازی لە ئاوازدانان و گۆرانی وتن نەئەهێناو دوا ئاوازی بۆ شیعرێکی (مصطفی بەگی کوردی) دانا بە ناونیشانی(شوێن کەوتن). دواکاری شانۆیشی شانۆیی (بەزۆرکردیان بە دکتۆر) لە نوسینی (مۆلێر)ی فەرەنسی بوو، کە هەر خۆی لە زمانی عەرەبییەوە وەریگێڕابوو بۆ کوردی و هەر خۆشی دەرهێنەر و ڕۆڵی سەرەکی شانۆگەرییەکەشی دەنواند.

تا ناوەڕاستی شەستەکانیش کتێبی هەمە جۆری دەخوێندەوە، خاوەن کتێبخانەیەکی باشیش بوو، بەڵام دواتر بە هۆی کێشەکانی ژیان و ئیش و کارەوە کەمتر فریای کتێب خوێندنەوە دەکەوت، بەڵکو زۆرتر بە ڕۆژنامە گەرییەوە سەرقاڵ بوو تا دوا ساتەکانی تەمەنی.

لەگەڵ ئەمانەشدا ڕەفیق چالاك پیاوێکی قسەخۆش و ڕۆشنبیرو بەدەم و دووبوو، حەزی لە نوکتەبوو، پەندو سەرگوزشتەی زۆری دەزانی، ئەوەی لە کۆڕیدا بەشدار بووبێت حەزی نەکردوە ئەودانیشتنە کۆتایی بێت. پیاوێك بوو حەزی لەجل و بەرگی جوانبوو، بەکورتی پیاوێکی ئەنیق و پاك و خاوێن بوو، بەردەوام ڕیشی تاشراوو بۆن و بەرامەی خۆشبوو، حەزی بە سەیران و گەشت و گوزاربوو، تادوا ڕۆژی ژیانی لەگەڵ خێزان و خزم و برادەرەکانیدا چونەدەرەوە و سەیرانی ڕێك دەخست. لە خواردنیشدا زۆر بەسەلیقەبوو، حەزی لە خواردنی خۆش ئەکرد، هەندێکجار خۆی دەچوو بۆ بازاڕ و ئەو خواردن و میوەتازە و نۆبەرانەی ئەکڕی کە بۆ یەکەمجار ئەهاتنە بازاڕەوە ئەگەرچی نرخیشی زۆرگران بووبێت.

**بەڕێز کاك ئازاد چالاکی کوڕی خەسڵەتێکی تری ئەم هونەرمەندە باس دەکات و دەڵێت:**

ڕەفیق چالاك هەرکەس لە دەرگای دابێت، دەرگای لێکردۆتەوە و یارمەتی داوە و ئیش و کاری بۆ جێبەجێ کردوە و بە هۆی پەیوەندیەکانیەوە لەگەڵ کەسایەتیە ناسراوەکاندا قسەی دەڕۆیشت و قورسایی لای خەڵك هەبوو.

ڕەفیق چالاك پێی خۆشبوو بە بەردەوامی دەوری قەڵەباڵغ بێت و چێژولەزەتێکی زۆری لە هاتووچۆو سەردانی خەڵك و مەجلیسی دۆست و ڕەفیق دەبینی، هەروەك ئەوەی بزانێت تەمەنی کورت دەبێ، ئەژیا بۆ ئەو ڕۆژەی... بۆ ئەوساتەو بۆ ئەو کارەی کە ئەیگرتە ئەستۆ، ئێستا من بیر لەو ڕۆژانە دەکەمەوە کە دوا ڕۆژی تەمەنی ژیانی ئەوبوو، ئەو پرسیارەم لادروست دەبێت ئەو بەو نەخۆشییەوە، بەوبێ ئومێدییەوە چۆن دەیتوانی ئەو هەموو کارە ئەنجامبدا کە بە جۆرێك لە جۆرەکان لە حاڵەتی ئینتحاری لەسەرخۆو عەزیەتدانی جەستەو ڕۆح دەچوو.

***کاك ئاوات چالاکی برازای دەڵێت:** مامم کەسێتیەکی بەهێزی هەبوو هەر چەندە لە ئێمەوە دووربوو بەڵام کەیەکترمان دەبینی ئامۆژگاری و ڕێ پیشاندەری دەکردین نەك هەر لە بواری هونەردا، بەڵکو لەسەرجەم بوارەکانی ژیان و هەڵسوکەوت و تێکەڵ بوونمان لەگەڵ خەڵکدا. مامم بەردەوام هێمن و سەرقاڵ بوو بە کاری هونەری و سیاسی و ڕۆشنبیری، لەگەڵ ئەمانەشدا ئارەزووی لە ئاهەنگ و دانیشتن و قسەی ئەستەق بوو، پیاوێکی بەوەفابوو. زۆرهانی دەدام و هەوڵی لەگەڵ دەدام کە فێری زمانی تربیم وەك زمانی عەرەبی، هاندەرێکی باشیشمبوو بۆ ئەوەی خوێندن تەواوبکەم.

***کاك( ئازاد چالاك ) باس لە خۆشەویستی باوکی دەکات و دەڵێت:**

هەموو باوکێك لای منداڵەکانی خۆشەویستە و تایبەتمەندیەکی گەورەی هەیە و کەم باوك هەیە لەم یاسایە بەدەربێت، بۆیە باوك کاریگەری خۆی لەسەربنەماڵەکەی بەجێ دێڵێت و دەبێتە سیمبول.

سەبارەت بە ئێمەش لەگەڵ باوکماندا زۆر نە ژیاوین، چونکە چاومانکردەوە ئەو خەریکی سیاسەت و چەندین جار زیندان و

دووركەوتنەوە و پێشمەرگایەتی بووە و باقی كاتەكانی لە نێوان هونەر و دۆست و هاوەڵەكانی و ئێمەدا دابەشكردوە ئەوەندەی بیرمە لێرەدا باسی بكەم ئەوەیەكە ئەو ڕۆژانە دوای گەڕانەوەی لەدەوامی خۆی زۆربەی ڕووداوەكانی ئەو ڕۆژەی بۆ دایكم و ئێمە دەگێڕایەوە، بە دەم قسەكانی خۆشیەوە نوكتەو ڕووداوەكانی ئەكردە سیناریۆیەك و سەرنجی هەموومانی بۆلایخۆی ڕائەكێشاو ئێمەش بەو هیوایە بووین كە سەعاتێك زیاتر ئەو دانیشتنەمان درێژەی هەبێ.

لایەنێكی تری ژیانمان لەگەڵ ئەودا كە هەرگیز بیرم ناچێتەوە ئەوەبوو كە زۆربەی شەوانی زستان لە ماڵە سارد و سڕەكەی ئێسكان پێش ئەوەی وەنەوزیمانبباتەوە ئەچووینە ژێر جێگاوە، ئەو كە لەگەڵ ئەوەی كە زۆر ماندو و شەكەت بوو چیرۆكێكی كورتی یەجگار بەپێز و بەلەزەتی بۆ دەگێڕاینەوە، هەندێك لەو چیرۆكانە بە چەند زنجیرەیەك و بەچەند شەوێك تەواو نەئەبوو ئێستا داخی ئەوە دەخۆم كە بۆچی ئەو چیرۆكانەمان لەبەر نەكرد، یاخود دواتر نەماننوسینەوە، لەوانە(ئەمیرئەرسەلان، دابێژەلان، گەورەترین درۆ لە عالەمدا.... هتد).

***كاك چالاكیش باس لە پەیوەندی باوكی بۆ منداڵ دەكات و دەڵێ:**



باوكم منالی بەگشتی زۆر خۆش دەویست و خۆشەویستیشی بۆ منالەكانی لەوەدا دەردەكەوت كە خۆی زۆر بەپەرۆشەوە لە نزیكەوە لێی لە ئاستی خوێندنمان لە قوتابخانە و باری تەندروستیمان و جل و بەرگ و.... هتد) دەپرسییەوە و لەگەڵ دایكمدا پێداویستیەكانیان بۆ دابین دەكردین.

ئەوەشم لە بیر ئەچێت هەر لە تەمەنی(10)ساڵیمەوە باوكم لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆ كۆمەڵی هونەرە جوانەكان و نوسینگەی ڕۆژنامەی(برِوا) كە خۆی دەری دەكرد لەشاری سلێمانی، مەبەستیشی لەوە بێ گومان چاوكردنەوە و تێكەڵ كردنی من بوو بەو بوارانەی كە خۆی كاری تیا ئەكرد، بۆیە منیش و دواتر براكانم ئەو خۆشەویستیەمان تیا دروست بوو بەرامبەر بە هونەری شانۆ و گۆرانی و مۆسیقا، لە پۆلی چوار و پێنج و شەشەمی سەرەتایمدا لە هەندێك شانۆگەریدا بە شداریم كردوە، وەك كۆمبارس لە(بوكی ژێرەدەواری ڕەش، خەسوو یا ئەژدیهاو.... هتد). هەروەها لە قوتابخانەشدا بە حوكمی ئەوەی من كوڕی (ڕەفیق چالاكم) ئەبوایە دەنگم خۆش بوایە و سروودی بەیانیانم لە كۆڕەپانی خوێندنگەدا بووتایە، لە قوناغەكانی دواتریشمدا لە بواری ئێزگەدا وەك دەكتەر و ئامادەكار و پێشكەشكاری بەرنامەو وەك بێژەری كوردی و عەرەبی كارمكردوە لە ئێزگەی كوردستانی عیراق و ئێزگەی بەغدا و دەنگی گەلی كوردستان.

***كاك ئازاد چالاكیش باس لە بەشداریەكانی منالی دەكات لە بواری هونەردا:**

من و براكانم لە سەرەتای منالیمانەوە و بە هۆی باوكمانەوە ڕۆڵی بچوكمان پێدراوە و لە چەند شانۆگەریەكدا بە شداربووین لەوانە(پیسكەی تەڕپیر و بەزۆركردیان بە دكتۆر.... هتد) لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە كەسمان لایەنی هونەرمان بە گشتی نەكردە پیشەی خۆمان و ناشزانم هۆكەی چییە؟! هەندێك جار ئەمە ئەگەڕێنمەوە بۆ ئەوەی كە هەریەكێكمان وامان بیركردبێتەوە كە هەرچی بكەین نەك هەرناگەینە ئاستی تواناو بەهرە جیاجیاكانی ئەو، بەڵكو دووریش نییە كە كارێكی خراپ بكەینە سەر ناوبانگی و پێشم وایە مرۆڤ خۆی دەبێت بزانێ بەكەڵكی چ كارێك دێت وچ بەهرەیەكی تێدایەو لە چ بوارێكدا دەتوانێت سەركەوتووبێت و پەلاماری هەمووشتێكیش نەدات و ئەو كەسەش كە بە توانا و لێهاتوویی خۆی ئەچێتە پێشەوە، ئەوا زەحمەتە بەردەوام بێت و دوای خۆشی كەس ئەسەفی بۆ ناخوات و ڕەحمەتی بۆ نانێرێ. منیش وا خۆم دەبینم كە دەتوانم لە بواری ڕاگەیاندندا خزمەتێك بگەیەنم و هیواداریشم بەهەڵەدا نەچوویم. ئەوەشی كە من لە باوكمەوە فێری بووم و پەیڕەویشم كردوە ئەوەیەكە ئەو وزەو توانایەی كە مرۆڤ هەیەتی جا لە هەر بوارێكدا بێت ئەبێ بیخاتە گەڕو بەكاری بهێنێت و گوێ نەداتە ماندوبوون و هیلاكی و كۆڵیش نەدا بەرامبەر ئەو كۆسپ و تەگەرانەی كە دێنەڕێی و ئەوەی لە هەگبەیایەتی هەڵبڕێژێ و سود لە تاقیكردنەوە و هەڵەكانیشی وەربگرێت.

هەروەها ئەوەی من لە هونەر و بەرهەمەكانی(ڕەفیق چالاك) تێگەیشتبم ئەوەیەكە ئەوزاتە جگە لە گۆرانی سیاسی و سروود و ئاوازەكانی و چیرۆكی تەمسیلی و شانۆگەری و نوسینەكانیشی چەكێك بوون بە كاری بردوون دژی ئەخۆشیە كۆمەڵایەتی و دیاردە دزێوەكانی ناو كۆمەڵی كوردەواری و ئەوەی چاوێك بەو بەرهەمانەدا بخشێنێتەوە كەلەو سەردەمەدا بڵاوبۆتەوە چ لە ڕادیۆی كوردی بەغدا و چ بڵاوكراوەكانی ئەو سەردەمە بۆی دەردەكەوێت ئەوكارە چەند گەورەبووە بێ مەترسی و بێ ناحەزیش نەبووە.

***كاك ئاوات چالاكی برازای( ڕەفیق چالاك ) باس لەو كاریگەریەدەكات كە هونەرمەند( ڕەفیق چالاك ) دایناوە لەسەری و دەڵێت:**

لە ساڵی1963 كاتێك زەعیم صدیق لە سلێمانی بوو كۆمەڵەی هونەرەجوانەكانی‌سلێمانی ئاهەنگێكیان دەگێڕا لە(نادی مۆزەفین)، ئەوكاتە من تەمەنم9ساڵ بوو لە شانۆگەرییەكدا لەگەڵ مامدا بە شداریم كرد، بەڵام بەداخەوە ناوەكەیم لەبیرنەماوە، هەرچەندە ئەو ڕۆڵەی من بینیم لە شانۆگەریەكەدا ڕۆڵی منداڵێك بوو بە پانتۆمایم بڕگەی ئاهەنگەكەش لە مۆسیقاو گۆرانی و شانۆ پێكهاتبوو، بەڵام بەداخەوە بۆ بەیانی هەندێك لە بەشدارانی ئاهەنگەكە لەلایەن دەستەو دایەرەی زەعیم صدیقەوە گیران.

ئەو كاتە كۆمەڵەی هونەرەجوانەكان هەمووشەوانێك هەم وەك پرۆڤەكردن و هەم وەك پێشكەشكردنی بەرنامەی چالاكیەكانیان لە بینای كۆمەڵ كۆدەبوونەوە و دەستیان دەكرد بە پرۆڤەی چالاكیەكانیان، منیش وەك زۆربەی كەس و كاری ئەندامەكانی كۆمەڵ لەگەڵ باوكمدا سەردانی ئەوێم دەكرد و تامەزرۆی ئەوكارانەبووم و حەزم دەكرد بەشداربكەم، لەبەر ئەوەش باوكم ئەندامێكی كۆمەڵ بوو لە شانۆگەریەكانیشدا لەگەڵ مامم بەشداری دەكرد، ئیتر منیش وەك كۆرس بەشداریم دەكرد، خۆدیارە مامم كاریگەری تەواویشی لەسەرباوكم هەبوو، بەوپێیەی ئەو براگەورەی بوو، نەك هەر هانیدەدا بۆ كاری هونەری،

بەڵکو ماندەریشی بوو بۆ بەشداری سیاسی، هەر بۆیە چەندەها جار باوکم لەلایەن حوکمەتی ئەوکاتەوە گیراوە لە سەرمامم، بۆ نموونە جارێکیان لە نوگرەسەلمان کەگیرابوو لە سەرمامم هەموو لەشیان کردبوو بە خوێن، بە کورتی باوکم بەهۆی مامەوە توشی لێدان و گرتن و دەربەسەری و ناخۆشی زۆرهات.

***کاك ئازاد چالاك باس لە چۆنیەتی ژیانی باوکی و خۆیان دەکات لە کۆتایی ساڵی شەستەکانداو دەڵێت:**




کاتێك بیرەوەری و یادگارەکانم دەگەڕێنمەوە بۆ سەردەمێکی زووتر و بە(تحدید) کۆتایی شەستەکان، ئەو داوای لێکردین کە هەموو بچینەشاخ و لە(چۆمان) گیرساینەوە لە نزیك بارەگای رادیۆی(دەنگی کوردستانی عێراق) ئەوپرسیارە دێتەپێشەوە کە بۆچی ئێمەی هەموو لە خوێندن چەند ساڵێك محروم کرد و بۆچی بیری لە خەتەری بوردومان و ژیانی ناخۆشی شاخ نەکردەوە بۆ ماڵ و منالی، ئەی باشە ئەگەر ئەوانەش هەمووی هەرکاری ئاسایی بن! ئەی ئەبێ هۆی چی بێ کە کوڕەکانی خۆی لەو تەمەنکەمەدا بخاتە بەرتاقیکردنەوەی قورسی ژیان، ئەبێ چ هۆیەك بێ و چ بیروباوەڕێك بێت وا لە باوکێك بکات کە کوڕەگەورەکەی(چالاك) بخاتە خولی مامۆستایان و دواتریش بچێتە گوندێکی دوور لە شوێنی خۆی یان چ هۆیەك وای لێبکات کە کوڕی دووەمی(ئازاد) لە تەمەنی هەرزەکاریدا بخاتە خولی برینپێچی و کوڕی سێهەمیشی(شەهید شێرزاد) کە دوانزەساڵ بوو ناونوس بکات بۆ خولی(مدفعی) و بۆچی بیری لەوە نەکردەوە کە هەریەکەمان بنێرێت بۆ ژیانێکی خۆشتر و باشتری بێ مەترسی؟! کەم کەس دەزانێ(رەفیق چالاك) و بنەماڵەکەی چۆن ژیان و چۆن ئەو ڕۆژگارە تاڵانەیان بەسەربرد، کەم کەس دەزانێت ئەو زاتە چ دەربەسەری و کوێرەوەریەکی لە ژیاندا بینی سەرەڕای ئەوەی کە پارچەیەك لە ووزە و ئەقڵ و بەهرە و داهێنان بوو.

کەم کەس دەزانی ٘ت کە ساڵی1965 خوشکێکم بە ناوی(بەیان) نەخۆش دەکەوێ و باوکم و هەندێك لە خزم و کەسوکار بەدیارییەوە دەبن لە نەخۆشخانەی(جمهوری سلێمانی) تا لەو کاتەدا کۆمەڵێك سەرباز و ئەفسەر خۆیان ئەکەن بەژووردا و لەبەر چاوی(بەیان) پەل باوکم دەگرن و دەیبەن(بەیان)یش لەوکاتەدا بەدەم هەنسکەوە هاوار دەکات: باوکم بۆکوێ دەیبەن؟! رەفیق چالاکیش لە وەڵامدا دەڵێ: کچم هیچ نییە ئەڕۆم ئێستایەمەوە. ئەوانەی کە لەوێ بوون دەیگێڕنەوە کە(بەیان) دوارستەی خۆی دەڵێ: تازە باوکم نابینمەوە. هەردوای ئەوە بە چەند ساتێك(بەیان) بۆ دواجار چاولێك دەنێت، رەفیق چالاك نزیکەی حەوت مانگ دەگیرێ لە سلێمانی و کەرکوك وەهتا لە زیندان بەردەبێ بە هەواڵی مردنی(بەیان) نازانێت.

زۆرجار ئەو پرسیارەم لێ دەکرێت بۆچی ئێوە وەك بنەماڵە کەمتەرخەمن لە کۆکردنەوەی ڕەنج و بەرهەمی باوکتان؟ بۆچی کەستان هونەرتان نەکردەپیشە؟ ئایا ئەگەر(رەفیق چالاك) سیاسەتی نەکردایە چەند بەرابەر ئەوە ئەیتوانی خزمەتی هونەر و ئەدەب و رۆشنبیری کوردی بکردایە؟ زۆر پرسیاری تر کە دەرفەتی وەڵامدانەوەی نیە.

***کاك چالاك سەبارەت بە مامەڵەو بیرو بۆ چونەکانی رەفیق چالاك لەبارەی یەکسانی ژن و پیاوەوە دەڵێت:**

بیروباوە ڕوڕیبازی(رەفیق چالاك) لە سەرەتای لاویدا بیروباوەڕێکی پێشکەوتوو خوازی هەبووە. دژی خوو نەریتێکی دواکەوتووبووە کە زەرەری گەیاندبێ بە مافی مرۆڤ، ئەمەش لە زوربەی نوسینەکانی و شانۆو تەمسیلیەکانی ئیزگەی بەغدا و گۆرانی و سروودەکانی بەڕوونی ڕەنگی داوەتەوە و دیاروئاشکرایە. یەهیچ جۆرێك جیاوازی لە نێوان کوڕو کچەکانیدا نەکردووە و دەتوانم بڵێم کچەکانی زیاتر خۆش ویستووە لە کوڕەکانی، هیچ کاتێك هەستم نەکردوە لایەنگری کوڕەکانی بگرێت و زۆر لە کچەکان بکات، تەنانەت لە ئیشی ناوماڵ و ئەرکوکاری ڕۆژانەدا کوڕەکانی وەك کچەکان هەڵدەسوڕان و ڕازی نەدەبوو کوڕێکی ئیش بە کچێکی بکات، بەڵکوداوای لە کوڕەکەی دەکرد کە خۆی ئەوکارە بکات.

هەردەم ئەوەی بۆ هەموومان دەردەخست کە جیاوازی نییە لە نێوان کوڕوکچدا و ئێمەی بەو شێوەیە پەروەردە دەکرد. زۆرمەبەستی بوو کچەکانی وەك کوڕەکان بخوێنن و بگەنە پلەوپایەیەکی بەرز، مامەڵەی لەگەڵ دایکمدا مامەڵەیەکی پڕ لە ڕێزوخۆشەویستی بوو. زۆر مەبەستی بوو خێزانەکەی بەشداری بکات لە بینینی کارە شانۆییەکانی و لەکاتی ئاواز دانانیشدا داوای دەکرد گوێ لە ئاوازەکەی بگرین و ڕای خۆمانی لە سەردەربڕین.

***(ئازاد چالاك)یش هەر لەم بارەیەوە دەڵێت:**

رەفیق چالاك باوەڕی بە گۆڕان و پێشکەوتن و یەکسانی هەبوو لە ژیانی خۆی و ماڵ و منداڵیدا پەیڕەوی دەکرد، جیاوازی کوڕو کچی نەدەکرد و خۆی ئیشی ناوماڵی بەسەر هەمووواندا دابەش دەکرد وشتێك نەبوو پێی بوترێت ئەمە ئیشی کچە و ئەمەش ئیشی کوڕ، تەنها بۆ بازاڕ نەبێت کە دەبوایە من یا خود شەهید شێرزادی برام لەگەڵ دایکم بڕ ۆیشتینایە ئەویش لە بەرقورسی شوتی و گەرمای بەغدابوو.

ئێمە وەك بنەماڵە دەرامەتمان کەم بوو، ئەوکاتانەی کە باوکم پارەیەکیشی دەسکەوتایە ئەوا زۆر بە دەست بڵاوی سەرفی دەکردوبیری لە ڕۆژی ڕەش و دوارۆژ بۆئێمەنەدەکردەوە(ئەوەندەی کەمن تیبینیم کردبێ) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دایم ئێمەی ئەخستەپێش خۆیەوە و هەوڵیدەدا ئەوەندەی لە توانایدا بێت خۆشی بخاتە دڵمانەوە و بێ پارەییمان پێوەدیارنەبێت و لەوەشدا ڕۆڵی زۆرگەورە بۆ دایکم دەگەڕێتەوە کە بە شانازییەوە لە دوای هەموو گرتن و دەرکردن لەوەزیفەو واز هێنانێك ماڵ و منداڵ و بژێوی ئێمەی ئەگرتە ئەستۆو ئێمە هەموومان بە باوکیشمەوە قەرزاری ئەوین و دوای کۆچی دوایی باوکیشم هەردایکمبوو

کە ماڵ و حاڵی بۆ پێکەوە ناین و بەتەگبیری ئەو ئێمە خوێندن و ژیانمان بەڕێکرد.

خۆشترین ماوەی ژیانی ئێمە لەگەڵ باوکماندا لەوتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکان بوو، تەنها ئەو چەند ساڵە ئێمە جۆرێک لە جێگیری(استقرار) و خۆشیمان بە خۆمانەوە دی و توانیمان ناو ماڵێکی ڕێک و پێک و سەیارەیەکیش بکڕین و چەند سەیرانێکیش بکەین.

***کاک ئاوات بەم شێوەیە دەربارەی ڕەفیق چالاکی هونەرمەند دەڵێت:**



مامم خاوەنی هیچ بڕوا نامەیەکی هونەری نەبوو کە لە ئەکادیمیایەکدا خوێندبێتی، بەڵام بەشێوەیەکی خۆرسک و بەرچاو پێشکەوت بە دەنگ و ئاواز دانان و بە نوسینی شانۆگەری و وەرگێڕانی دەقی شانۆیی و بەنواندن و بە دەرهێنان و تەمسیلی ڕادیۆیی خۆی لە دڵی خەڵکیدا جێگیرکرد، بەڵام بە داخەوە بۆ هەموو تیپەکانی سلێمانی هەرلە مۆسیقی و شانۆکاران و ئێزگەکانی هەرێم، باسی ڕۆڵی زۆرێک لە هونەرمەندان دەکەن، بەڵا م تەنانەت ناوهێنانی ڕەفیق چالاک لە یاددەکەن، جاچ لە فستیڤاڵە شانۆییەکاندا بێ یان لە بەرنامەکاندا بێ یان لە خەڵاتی ڕێزلێنانی هونرمەنداندا بێت.

***کاک ئازاد چالاک لەسەر ڕێگەیەک لەڕێگەکانی باوکی دەڕوات و خۆی تێدا سەرقاڵ کردوە ئەویش کارکردنیەتی لە بواری ڕادیۆو تەلەفزیۆندا، خۆی سەبارەت بەم کارە هاوشێوەیە دەڵێت:**

کارکردنی من لە ڕادیۆو تەلەفزیۆندا سەرەتا بەرێکەوت و بەهۆی عەرەبی زانینەوەبووە دواتریش پلەبەپلەو دوای کەڵک وەرگرتن بووە لە ئەزموون و تاقیکردنەوەی کە سانی ترکە لە بواری ڕاگەیاندنی(ی.ن.ک)دا کاریان کردوە و سوودم لێ وەرگرتوون، من لەوانەوە فێری سەرەتاکانی داڕشتنی هەواڵ و وەرگێڕان و نوسینی و تاروو زۆر لایەنی تری بواری سیاسەت و ڕاگەیاندن بووم، بەڵام بەنسبەت ڕەفیق چالاکەوە لەوانە یە حاڵەتەکە جیاوازبێ، چونکە ئەوکاتەی کە ئەو دەستی دایە قەڵەم و داهێنان نووسەر و خەڵکی بە توانا و خاوەن بەهرە کەمبوون و ئەو بووارانە بۆ ئەوان و بۆ کورد تازەبوون.

***کاک ئاوات سەبارەت بە نازناوی چالاک دەڵێت:**

نازناوێکی خێزانی مامم و باوکم بووە، بەڵام پێویستە هونەرمەندان و ڕۆشنبیران ئاگاداری ئەونازناوەبن، چونکە هەندێک هونەرمەند کە هیچ نزیکایەتی و خزمایەتیەکیمان لەگەڵ ڕەفیق چالاکدا نیە و نازناوی چالاکیان هەڵگرتووە ئیتر نازانم لە بەر ڕێزەبۆ ئەو یان چی؟

***هەر کاک چالاکیش سەبارەت بە نازناوی چالاک دەڵێت:**

شانازی زۆری بە نازناوی چالاکەوە دەکرد، هەربۆیە منیشی ناونا(چالاک). وەک لە بیرم مابێ جارێکیان باسی ئەو نازناوەی خۆی کردو ووتی: ئەونازناوە خۆم لە خۆمم نەناوە، بەڵکو لەبەر چالاکی و وریایی و زیرەکی ئەم نازناوەم لەلایەن شاعیرو نوسەرێکی کوردەوە لێنراوە کە بەداخەوە ناوەکەیم لە یاد نەماوە. هەر لەبەر خۆشەویستی زۆریش بۆ باوکم گۆرانی بێژی گەورەمان(محمدی ماملێ) کوڕێکی ناوناوە(چالاک).

***کاک چالاک باس لە ژیان دۆستی و مرۆڤ دۆستی ڕەفیق چالاک دەکات و دەڵێت:**

ڕەفیق چالاکی هەمیشە عاشق و ڕۆحسوک، ئاوازی بۆ جوانی و نیشتمان و ڕۆڵەکانی دواڕۆژدا دەناو تێکەڵ بە دەردو ئازار وخۆشی و ناخۆشی و فرمێسکی گەلەکەی بووبوو. تادوا هەناسەی هەرخەمخۆری گەلەکەی بوو، وەک مۆمێک ئەسوتا و ڕووناکی دەبەخشی بە چواردەوریدا، لەبیرەوەریەکانیدا دەڵێت:-(لەبەریەلەشت لە مردن ئەترسم ئەویش ئەوەیە کە مردن نەیەڵێت پوختەی ئەوەی فێری بووم بیگەیێنم بەنەتەوەکەم، هەرچی یەکیشم پێشکەش کردبێت، دەستەبەرەیەکی بچوک ودیارییەکە لە کابرایەکەوە بە کوردی هاتەدنیاوە و بە کوردی تیایاژیا).

لە ساڵی 1946دا شانۆگەری(لەڕێ ی نیشتماندا)ی لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕییدا نمایش کردودا هاتەکەشی تەرخانکرا بۆ یارمەتی دانی لێقەوماوانی کارەساتی بوومە لەرزەکەی(پێنجوێن). دوای ئەوەش هەمان گروپ چوونە هەولێرو لەوێش هەمان نمایشیان کردو مەبەستیش هەر زیاتر یارمەتیدانی لێقەوماوانی (پێنجوێن)بوو. ئەمەش یەکمجار بوو تیپێکی هونەری لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر بڕوات بەمەبەستی نمایشکردنی شانۆگەری.

ڕەفیق چالاک لە بیرەوەریەکانیدا دەڵێت:-(زۆرساکارانە کارمان دەکرد بێ ئەوەی تووشی هیچ لە خۆبایی بوونێک ببین، چونکە ئەوەی هونەرمەند دەکوژێ و لە ناوی دەبات ئەنانیەت و لەخۆبایی بوونە).

ڕەفیق چالاک وەک هونەرمەندێکی پێشکەوتووخواز هەمیشە خولیای ئەوەبوو کە هونەرمەندانی کوردستان یەکبخات و لە چوارچێوەییەک کۆمەڵدا کۆیان بکاتەوە، بۆ یە لە بیرەوەریەکانیدا دەڵێت:(براییە پێ ڕاتەکێنن و بنووسن و بەرهەمەکانتان تۆمار بکەن و یەکتریتان خۆش بوێ و ڕێزی یەکتری بگرن و بەیەکا بجۆشێن، ئەی هونەرمەندانی کوردستان... کۆمەڵی هونەرە جوانەکانی کوردستان پێک بهێنن).

***کاک ئازاد باس لە دواساتەکانی تەمەنی ڕەفیق چالاک دەکات و دەڵێت:**

ساڵی 1973لە گەڕەکی(کەڕادە) لە بەغدا ماڵێکی خنجیلانەمان بەکرێ گرتبو کەمێک بوژابووینەوە، باوکم بەیانیان ئیشی دائیرەی ئەکرد و ئەوکاتە(مدیری مەرکەزی ئەعلامی وەزارەتی شئون ئەلشمالبوو)، پاش نیوەڕوان و دوای نانخواردنێکی بەپەلە سەیارەیەکی دائیرە ئەهات بە شوێنیاو ئەچوو بۆ ڕۆژنامەی برایەتی و هەتا کاتێکی درەنگ لەوێ کاری دەکرد و هەر بەدەم ئەوەشەوە چەند بەرنامەیەکی بۆ ڕادیۆی کوردی بەغدا

بە ناوی (ڕازونیاز و سۆز و ئاوان) ئامادەو پێشکەش دەکرد، ئەمەجگە لەئیشــی حزبــی و ئیشــی وەرگــێڕان و دانــانی ســـیناریۆ بـــۆ شـانۆگەری(بـەزۆرکردیان بـە دکتـۆر) و دامـەزراندنی کۆمـەڵی هونـەرە جوانەکان لە بەغدا و... هتد کە من لە یادم نییە یاخود نایزانم.

کـاتێك ڕەفیـق چـالاك کوێـرەوەری ژیـان و هیلاکـی و مـاندووبوون تـین و ورووژمی بۆ دێنن و زەفەر بەو دڵە گەورەیەی دێنن پزیشکەکانی(مدینە الطب) ی بغـدا بـێ ئومیـد دەبـن و زۆرشـتی لێ قەدەغەدەکـەن وەك جگـەرە، چـەوری، خەفەت،... هتد، ئێمـەش هـەموان هـەوڵی زۆرمـان دەداکـە خـۆی هیـلاك نـەکات، ئەویش بەڵێنی وازهێنانی لە هەموو ئەوشتانەدا تەنها شت کە نەیتوانی تەرکی بکاو لە بیرخۆی بەرێتەوە معاناتی خۆی و خولیای هونەر و گۆرانی بوو.

هەر لەو ماوەیـەدا و لەسـەر قەرەوێڵـەی نەخۆشـی ئاوازی بۆ چەند گۆرانیـەك داناو لە ماڵیشـەوە و لـە مـاڵی(حەسـیب صـاڵحی ئـەندازیار) لەسـەر کاسێت بـە هەناسـەیەکی بـێ ئومێـدی غەمناکـەوە تۆمـاری کـردن ئەوشـیعرانە کـە ئـەو هـەڵیبژاردن و ئـاوازی بـۆ دانـان کـت وەت گوزارشـتیان لـە حـاڵ و وەزع و بیرکردنەوەی ئەو ڕۆژگارەی ئەودەکرد، بۆ نموونە ئەم شیعرەی عەبدوڵاگۆران کە دەڵێ:

بە کوڵ گریان لە چاوم دێ

گوڵی لاولاوی ڕەنگاو ڕەنگ

....................هتد

ڕەفیق چالاك بەدوو ئامێرو بە دووجار شیعری دوێنێ و ئەمڕۆی مامۆستای بەرێزمان(محەمەدی مەلا کەریمی) کردوە بە گۆرانـی، یـەکێکیان بە عودەکەی هونەرمەندی ناسراو و خۆشەویسـت خـوا لێخۆشبوو(شـەماڵ صـائب) و ئـەوی تریشـیان بـەکلارنێتی هونەرمـەندی خوالێخۆشـبوو(شـەوکەت ڕەشـید)، دیـارە شیعرەکەش زۆر کاری لە حاڵەتی دەرونی ڕەفیق چالاك کردوە و دەڵێت:

گیانە دوێنێ دەرون ماڵێکی ئاوابوو

بەهەشت بوو خانەی خوابوو

جێنزرگەی پێغەمبەربوو

مایەی شکۆ و تاجی سەر بوو

بەڵام ئەمڕو دوربێ گیانە لەباڵای تۆ

لەچۆڵێکی پڕ دڕندە و دڕکو داڵ.

پێخاوس و تاك و تەنیام

..........هتد.

یاخود ئاوازی سێیەمیشی کە بۆ شیعری (شوێن کەوتن)ی (مصطفی بەگی کوردی) داناوە و دەڵێت:

شیرینەکەم سبەی دەڕۆم بەجێت ئەهێڵم

ڕێگەی دووری گەڕانەوەی ئاسۆر ئەکێڵم

................هتد.

*هـەرکات ئـازاد سـەبارەت بـە نوسـینەوەی بیرەوەریـەکانی ڕەفیـق چـالاك دەڵێت: باوکم درەنگ دەستی بەنوسینەوەی بیرەوەریەکانی کرد و بەداخەوە زۆر کەمی نوسیی و فریا نەکەوت.

گەر کەسێك بپرسێ ئەرێ ڕەفیق چالاك لە چ بوارێکدا بەهرەمەند و وەستا بووە؟ وەڵامدانەوە ئاسان و بێ هەڵوەستە و تێڕامان نابێ.

ئایا لـە ئاوازدانـان و سروددا وەستا بـووە یـاخود لەدەنگخۆشـی و گۆرانـی وتندا بەهرەمەند بووە ئایا لایـەنی پەخشـان و وتـار و نوسین و زمـان ڕەوانیـدا بەهرەدار بووە یـاخود لـەوەرگێڕان و سیناریۆ و تەمسیل و دەرهێنان بلیمـەت و لێهاتو بووە؟ ئایا لـە بواری ڕۆژنامەگەری و ڕادیۆدا دەستی باڵای هـەبووە زیاتر یـاخود لـە بـواری وتـاربێژی و بـەڕێوە بردنـی کـۆڕ و مـەجلیس؟ ئایـا چ بـیر و هزرێکی وردی هەبووە و چۆن توانیویەتی لەیەك کاتدا ئەم هەموو کارانە و هی تر بەباشترین شێوە ئەنجام بدا و پێشکەشی نیشتمان و هاوزمانی خۆی بکات.

ڕەفیـق چـالاك دوای خـۆی هیـچ پـارە و خـانو و ئـەرزێکی بـۆ ئێمـە بـەجێ نەهێشـت، لـەژیانی خۆشـیدا ئـەو فرەتوانـا و بەهرەیـەی بـۆ کەسـبی مـاددی و خۆش گوزەرانی خۆی و منداڵەکانی و دەوڵەمەند بوون بەکار نەهێنا و نەکرد. لەگـەڵ هـەموو ئـەو خزمەتـە گەورەیـەی کـە بەمیللـەت و نیشتمانەکەی بەخشـی وەکو هەموو مرۆڤێك معصوم و بەدەریش نەبووە لە هەڵە و کەمو کورتی.



سرية

منطقة معارف السليمانية

العنوان البرقي — معارف السليمانية

رقم التلفون — السليمانية ٣٤

يرجى الاشارة الى الرقم كاملاً

العدد ٨٦١٨

التاريخ ٢٥/٨/١٣٦١

الموافق ٦/٩/١٩٤٢

موضوع انتداب خمسة من العراقيين الاكراد للاذاعة اللاسلكية في اللغة الكردية في مدينة يافـــا .

الى السيد رفيق توفيق معلم مدرسة ملكندي

" محمد رمزي قزاز معلم سابق في السليمانية

" ابراهيم صالـــح " " "

" نوري صديــق تلميذ في ثانوية السليمانية

بناء على ما جاء في مذكرة السفارة البريطانية في بغداد المرقمة ٩٦٧ والمؤرخة في ١٣/٨/٩٤٢ المبلغة الينا بكتاب مديرية المعارف العامة المرقم ١٦٥١٢ والمؤرخ في ١/٩/٩٤٢ وبالنظر الى انكم كنتـــم قد اعربتم عن استعدادكم لقبول الوظائف الخاصة بشعبة الاذاعة اللاسلكية في اللغة الكردية في مدينة يافـــا يرجى القيام باجراء ما يلي :—

١ — على السيد رفيق توفيق معلم مدرسة ملكندي ان يقدم استقالتـــه من وظيفته في المعارف فيما اذا تمت موافقته النهائية للانتساب — للشعبة المذكورة مع تزويدنا بموافقته الخطيـــة .

٢ — يرجى من بقية الذوات المذكورة اسماؤهم اعلاه ان يقدموا موافقتهم الخطية تبينون رغبتهم للانتماء في الشعبة التي تقرر فتحها .

على ان يرد تــــا الجواب بالسرعة الممكـــنة .

مدير منطقة معارف السليمانية

نسخة منه الى :—

مديرية ثانوية السليمانية
مدرسة ملكندي

للاطـــلاع .

